عبدالجبار قەرەداغی

# خدری زیندە

## ئامۆژگاری پێشکەش دەکات





چاپی یەکەم

١٤٣٣ك - ٢٠١٢م

# خدری زیندە
# ئامۆژگاریی پێشکەش دەکات


ئامادەکردنی

عبدالجبار قەرەداغی



چاپی یەکەم

١٤٣٣کۆچی ٢٧١٢کوردی ٢٠١٢میلادی

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: خدری زیندە ئامۆژگاریی پێشکەش دەکات
- ئامادەکردنی: عبدالجبار قەرەداغی
- بابەت: لێکۆڵینەوە لەسەر چیرۆک
- ساڵی چاپ: (١٤٣٣) کۆچی (٢٧١٢) کوردی (٢٠١٢) میلادی
- نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم
- چاپخانە: سیما
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- نەخشەسازیی بەرگ: مەریوان مارف
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٥٤٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.





پەیوەندی: (٠٧٧٠١٩٢٨٧٤٨) و (٠٧٥٠١٦٢٧٨٥٥).

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله ربّ العالمين والصلاة والسلام على سيّدنا محمّد و على آله وصحبه وسلم.

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە ئەم بونەوەرەی بەدیهێناوە و هەموو شتێکی لە نەبونەوە هێناوەتە بوون و ژیانی بە زیندووەکان بەخشیوە و هیدایەت و ڕێنمایی کردوون.

بەڕاستی هەموو کارێکی جوان هەر لە خوای گەورە چاوەڕێ دەکرێت، هەر خۆی دەزانێت چی دەکات و بۆچی دەیکات، هەندێك جار ویستی خوای گەورە کۆمەڵە شتانێك دەکات کە عەقڵ و ژیری مرۆڤەکان لێی تێناگەن، بەڵام پڕە لە حیکمەت و دادپەروەری.

ئێمە بەچاو شتانێك دەبینین و بە عەقڵی خۆمان هەڵی دەسەنگێنین و گفتوگۆی لەسەر دەکەین، کەچی ویستی خوای گەورە لە پشت ئەمانەوەیە.

پێغەمبەر ﷺ ئەو قورئان و پەیامە خواییەی بە ئەمانەت و دادپەروەری گەیاندە شوێنی خۆی بەبێ ئەوەی تەنها حەرفێکی لێ زیاد بکات یان کەم بکات، دیارە ئەمەیش بەڵێنی پڕ میهرەبانی خوایی یە.

لە کتێبە پیرۆزەکەی خوادا، کە قورئانە هەموو شتێك باس کراوە و ڕوون کراوەتەوە، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤایەتی داوەتەوە و هیچ شتێکی لە بۆشاییدا و بەبێ وەڵام جێ نەهێشتووە، شتانێکی تیا نییە کە لە پێویستی مرۆڤ بەدەر بن، بەڕاستی کتێبێکی زۆر عەجیب و سەر سوڕهێنەرە، هەرگیز نهێنییەکانی تەواو نابێت، دەریای مەعریفەت و زانینە...

ئەوەی شوێن ئەم قورئانە پیرۆزە بکەوێت هەرگیز گومڕا و سەر لێشێواو نابێت و وون نابێت، هەمیشە چرای ڕووناکی و هیدایەتی بەدەستەوەیە.

قورئانی پیرۆز زۆرێك لە چیرۆك و بەسەرهاتی پێشینانمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئێمەیش لەم کتێبەی بەردەستماندا باس و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی (خضر) خدری زیندە دەخەینە بەر چاو و دەستی خوێنەری خۆشەویست، بەو مەبەست و هیوایەی زانستێکی پێویست بگەیەنین و بچێتە تەرازوی کردەوە چاکەکانمان و سەرەتا خوای گەورە لێمان ڕازی بێت و لێمان قبولْ بفەرموێت و پاشان لای خوێنەرانی خۆشەویست ببێتە گەنجینەیەکی بچوکی زانیاری لە بیر و مێشکیاندا و هەوڵێك بێت بۆ کردنەوەی دەرگای گەڕان بە شوێن زانستە پێویست و بە کەڵکەکاندا.

ئەم بابەتە بە پشت بەستن بە کتێبەکانی تەفسیر و ژیانی پێغەمبەران و پیاوچاکان و پێشین و چیرۆکە قورئانییەکان ئامادە کراوە.

لێرەدا دەڵێم: خوایە گیان پاداشتی هەموو ئەو زانا و پیاوە پایەدارانە بدەیتەوە کە لەم بوارەدا خزمەتیان کردوە و قەڵەمیان بەکار بووە.

برا و خوشکان و خوێنەرانی خۆشەویستم: ئەگەر لەم کتێبەدا ڕاستی و ووشەی جوان و پەسەند و دروستتان بەرچاو کەوت، ئەوە لە خوای گەورەوەیە کە منی هیدایەت داوە و کردومی بە هۆکار بۆ گەیاندنی، و ئەگەر ناتەواوی و کەم و کورتی تیا بوو، ئەوە بەڕاستی لە خۆمەوەیە و خۆم هۆکار و بەرپرس بووم تیایدا، تکام وایە خوا لێم خۆش بێت و داواکاریشم کە جەنابتان لە هەڵە و کەم و کورتی ئامادە کردنەکە ئاگادارم بکەنەوە.

١٧-ذي الحجة-١٤٣٢هـ

١٣-١١-٢٠١١م

سلێمانی- حاجی ئاوا

## دەستپێك

(خضر) کێیە؟ و کەی لە دایك بووە؟ ئایا پێغەمبەر بووە یان پیاوچاك بووە؟ ئەگەر پێغەمبەر بووە کەی دەرکەوتووە و قەومەکەی کێ بووە؟ ئەگەر پیاوچاك و خواناس بووە، کێ ئەمەی ووتووە؟ و بەڵگەکانی کامانەن؟ و نهێنییەکەی چییە؟ ئایا ڕاستە کە گەیشتووە بە پێغەمبەر ﷺ و شتی لێ گێڕاوەتەوە؟! ئایا تا ئێستا زیندوە و لە ژیاندا ماوە؟ و ئەوە ڕاستە کە بە خەڵك گەیشتوە و بینویانە؟!

بەڕاستی ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکن، وەڵامێکی یەکلایی کەرەوەیان بۆ نەبووە کە پشتی پێ ببەسترێت و بۆچونە جیاوازەکان یەکلا بکاتەوە... ئەمانە کۆمەڵە بۆچونێکن کە لەناو کتێبەکانەوە گێڕدراونەتەوە... کۆمەڵە کەسانێك ئەم هەواڵانەیان کۆ کردۆتەوە و هێناویانە و پشتیان پێ بەستووە.

بەڕاستی زۆرینە بۆچونیان وایە کە ئەم بابەتە زۆر ئاسان نییە و ئەوەندەیش گرنگ نین کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت، بەڵکو هەمووی بیر و ڕای جیاوازە و یەك ناگرنەوە.

ئەو کەسەیش لێکۆڵینەوە لە شتی لەو جۆرەدا بکات نزیکە بکەوێتە هەڵەوە و ڕاستی نەپێکێت.

نمونەی ئەم جۆرە کارانە لە نێوان کەسە نەخوێندەوار و عەوامەکاندا بڵاوە، کە زۆر لە ڕاستییەوە دوورن، لەسەر بانگخواز پێویستە کە هەست بە ڕاستییەکان بکات و بیان دۆزێتەوە، تا خەڵکی ڕزگار بکات و نەکەونە ناو ئەو کەسانەی کە هاوبەشن لەم بیر و بۆچونە جیاوازانەدا، کە دەگونجێت لەناو هەموو کۆڕ و مەجلیسێکدا کۆمەڵێك لەم جۆرە پرسیارانە بورووژێت کە نمونەی شتی غەیبییە.

بەهەر حاڵ بەڕاستی چیرۆك و باسی (خضر) باسێكی خۆش و سەرنجڕاكێشە، چونكە كەسایەتییەكی دەگمەن و ناوازەیە، تەنها كەمێك نەبێت لە نهێنی و ڕاستییەكانی نەزانراوە...

لەبەر ئەوە لێكۆڵینەوە لەسەر ئەو پێویستی بە تێڕوانین و وریایی و ئاگایی زۆرە.!

بەڕاستی لە ژیانی (خضر)دا ئاماژە و پرسیار زۆر هەن كە ژیانی چۆن بووە و كردەوەكانی چۆن بوون و چی بوون. بەڕاستی هەرچەندە وەڵام بۆ پرسیارەكان ئامادە بكەیت، هێشتا پرسیاری تر سەر هەڵدەدەن و پێویست بە گەڕان بەدوای وەڵامەكانیاندا دەكات.

هەر وتەیەك وتەیەكی تر بەدوای خۆیدا ڕادەكێشێت.

# بەشی یەکەم
## ناو و نەسەب و لەقەب و (كنية)کەی

### ناوەکەی:

ڕا و بۆچونی جیاواز لەسەر ناوەکەی هاتووە، وتراوە: ناوی (بلین بن ملكان) بووە، هەروەها وتراوە: (إيليا) و (المعمر) و (أرميا) و (خضرون) و (بليا) و (إبليا) و (عامر) و (أحمد) و (اليسع).[1]

### نەسەبەکەی:

هەروەك چۆن ڕا و بۆچونی جیاواز لەسەر ناوەکەی هەیە، بێگومان ڕا و بۆچوونی جیاوازیش لەسەر ناوی باوکی هەیە. لەسەر ئەم بۆچوونانە وتراوە: (ملكان)، (كليان)[2] هەروەها (عاييل)[3]، هەروەها (قابل) و (فرعون) و (إبن بنت فرعون) و (طيفاء) و (مالك).[4]

هەروەها (الدارقطني) لە (الأفراد) و (ابن عساكر) لە ڕێگای (مقاتل بن سليمان) و ئەویش لە (الضحاك) و ئەویش لە (إبن عباس)ەوە هێناویانە کە:

---

[1] – سەیری ئەم کتێبانە بکە:(تهذيب الأسماء واللغات للإمام النووي ١٧٦/١) و (تفسير إبن كثير ٩٩/٣) و (البداية والنهاية ٣٢٦/١) و (الأصابه في تميز أسماء الصحابة ١١٥/٢) و (روح المعاني ٣١٩/١٥).

[2] – ووتراویشە (كليمان)، سەیری (تهذيب الأسماء واللغات للإمام النووي (١٧٦/١)بکە.

[3] – یان (عاميل)، یان (عمائيل).

[4] – فتح الباري (٣٠٩/٦)، و الأصا[illegible] ١١٥/٢).

کوڕی (آدم) بووە و لەپشتی ئەو هاتووە.[5] هەروەها لە (فتح الباري)دا هاتووە کە ئەم (حديث) فەرمودەیە (ضعيف منقطع)ە.[6] هەروەها لە (إرشاد الساري)دا.[7] و (إبن كثير) وتوویەتی: ئەمە (منقطع غريب)ە[8]، هەروەها (إبن حجر) ئەمەی لە (الزهر النضر)دا ڕوون کردۆتەوە و فەرمویەتی: (مقاتل) (متروك)ە و (الضحاك)یش لە (إبن عباس)ی نەبیستووە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).[9]

هەروەها (وهب بن منبه) نەسەبەکەی گەیاندۆتەوە (سامی کوڕی نوح).[10]

هەروەها (إبن عباس) لە (سعد بن مسيب)ەوە (إخراج)ی کردووە: کە دایکی (رومي) و باوکی (فارسي)یە و ناوی باس نەکردووە، و باسی ئەوەی کردوە کە (إلياس) برای بووە لەم دایك و باوکەوە.[11] هەروەها (الطبري) لە (عبدالله بن شوذب)ەوە (إخراج)ی کردوە و وتوویەتی: (الخضر) لە نەوەی فارس بووە و (إلياس) لە نەوەی (بني إسرائيل).[12]

پاش ئەم قسە و بۆچونانە (الآلوسي) وتوویەتی: هیچ شتێك لەم وتە و بۆچونانە لای من ڕاست نین، بێجگە لەوەی کە (النووي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەست دەکات و ئەوەی هەڵبژاردووە کە (بليا بن ملكا) بێت.[13] کە زۆرینە لەسەر ئەوەن و خوا زاناترە.[14]

---

5- روح المعاني للآلوسي ٣١٩/١٥.

6 - فتح الباري ٣٠٩/٦

7 - إرشاد الساري في شرح احاديث البخاري للقسطلاني ٣٨٤/٥.

8 - البداية والنهاية ٣٢٦/١.

9 - البداية والنهاية ١٨/١.

10 - روح المعاني ٣٢٠/١٥.

11 - فتح الباري ٣١٠/٦.

12 - تأريخ الأمم والملوك للطبري ١٨٨/١

13 - (بليا بن ملكان) وەك لە (فتح الباری)دا هاتووە.٣٠٩/٦.

## لەقەبەکەی:

لەقەب و نازناوەکەی (الخَضِر) ە.

ئەویش بە (فتحة) بۆ پیتی یەکەمی و (کسرة) بۆ دووەمی، یان بە (کسرة) بۆ یەکەمی و (سکون) بۆ دووەمی. گێڕانەوەکان بەو جۆرە (ثابت) جێگیریان کردووە. هەروەها ئەوەشیان جێگیر کردووە کە (أل)یشی دەچێتە سەر و لایش دەبرێت.

بەو ناوە لەقەب و نازناوی دەرکردووە – هەروەك (البخاري) و کەسانی تر لە پێغەمبەرەوە ﷺ (إخراج)یان کردووە.

(أبو هريرة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الخضر) بۆیە ناونراوە (خضر)، چونکە هەر کاتێك لەسەر زەوی وشك دادەنیشیت، گیای سەوزی لێ دەڕوا، و دەبوویە پارچەیەك سەوزی، جا لەبەر ئەوە ناونرا: (خضر) واتە: (سەوزایی و شینایی).[١٥]

هەروەها (إبن عساكر) و کۆمەڵێك لە (مجاهد)ەوە (إخراج)یان کردووە: بەوە نازناوی دەرکرد، چونکە کاتێك نوێژی دەکرد، چواردەوری سەوز و شین دەبوو.

هەروەها (إبن أبي حاتم) لە (عکرمة)ەوە (إخراج)ی کردووە: بەوە ناوی دەرکرد، چونکە کاتێك لە شوێنێکدا دادەنیشت دەور و پشتی سەوز دەبوو، هەروەها جل و بەرگەکەیشی سەوز بوو. هەروەها لە (السدي)یەوە (إخراج)

---

[14] – روح المعاني ١٥/٣٢٠.

[15] – سەیری (فتح الباري) ٦/٣٠٩ و (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول) (١٧١/٤) و (تأريخ الطبرية١/١٩٤) بکە.

کراوە: بێگومان کاتێك لە شوێنێکدا ڕابوەستایە ئەوا گیا لەژێر پێکانیدا سەوز دەبوو، هەتا قاچەکانی دادەپۆشی.
وتراویشە: هەروەها لەبەر ئەوەی بە شەوق و جوان بووە.[16]

## (کنیة)کەی:

(کنیة)کەی بریتی بووە لە (أبو العباس) وەك لە چەند سەرچاوەیەکدا هاتووە: لە (الأصابة)دا، دەڵێت: ئەمە (متفق علیه)یە.[17]
ڕەنگە ئەوەیش بێت بە بیرماندا بپرسین: بۆچی خوای گەورە ناوی ئەم بەندە پیاوچاکەی لە چیرۆکی موسادا (علیه السلام) باس نەکردووە. هەتا ئەم گرفتانە بڕایەتەوە و ئەم بیر و بۆچونە جیاوازانە کۆتاییان بهاتایە؟!
مامۆستا (سید قطب) خاوەنی تەفسیری (في ظلال القرآن) لە تەفسیر کردنیدا بۆ چیرۆکەکە وەڵامی ئەمەمان دەداتەوە و دەڵێت:
ئێمە لەبەردەم کۆمەڵێك کاری کوت و پڕ و یەك لەدوای یەکداین، و نهێنییەکەی نازانین، هەڵوێستی ئێمەیش بەرامبەریان وەك هەڵوێستی موسایە (علیه السلام)! ئێمە نازانین ئەو کەسە کێیە ئەم هەڵس و کەوتە سەیرانە دەکات، و قورئان هەواڵی ناوەکەی پێ نەداوین ئەوەیش بۆ تەواو کردنی ئەو کەش و هەوا ئاڵۆزەیە کە دەوری ئێمەی داوە ئیتر نرخی زانینی ناوەکەی دەبێت چی بێت؟ بەڕاستی تەنها بۆ ئەوەیە کە نمونەی حیکمەتی خوای بەرز و باڵای پێ بهێنرێتەوە، کە ئەنجامە چاوەڕوان کراوەکان لەگەڵ پێشەکییە نزیکەکاندا ڕێك ناکەون و ناگونجێن، بەڵکو ئامانج و مەبەستی دووریان لە پشتەوەیە، بە چاوی سنوردار نابینرێن. دیار نەبوون و باس نەکردنی ناوەکەی لەگەڵ کەسایەتییە مەعنەوییەکەیدا زۆر گونجاوە کە ئەو نوێنەرایەتی دەکات و بە نمونە دەهێنرێتەوە.[18]

---

16 – روح المعاني ٣١٩/١٥.

17 – سەیری (البدایة والنهایة ٣٧٢/١) و (فتح الباري ٣٠٩/٦) و (تهذیب الأسماء واللغات ١٧٦/١) و (الأصابة ١١٥/٢) و (روح المعاني ٣١٩/١٥) بکە.

18 – في ظلال القرآن لسید قطب ٣٩٩/٥ ط٥.

# بەشی دووەم

## سەرەتای ژیانی

زانا (إبن جرير الطبري) دەڵێت: (خضر) یەکێك بووە لەو کەسانەی کە لە سەردەمی ڕۆژگارەکانی (أفريدون الملك إبن أثفيان)دا[١٩] بووە.

وتراوە: ئەو لەپێش (ذي القرنين)ی گەورەدا بووە کە لە سەردەمی ڕۆژگارەکانی إبراهیمدا (عليه السلام) بووە.

ئەو کەسە بووە کە بڕیاریدا بە بیری (السبع) کە بریتی بووە لە بیرێك ئیبراهیم (عليه السلام) بۆ ئاودانی ئاژەڵەکانی هەڵی کەند، لە بیابانی (أردن)دا، پاشان قەومێك لە خەڵکی (أردن) داوای ئەو پارچە زەوییەیان کردووە کە ئیبراهیم (عليه السلام) بیرەکەی تێدا هەڵکەندبوو، ئینجا ئیبراهیم (عليه السلام) حوکم و بڕیارەکەی بردە لای (ذي القرنين) ئەویش باسی کرد کە (خضر) لە ڕۆژەکانی ژیانیدا لەو وڵاتەدا لەپێش ئەوەوە بووە...

هەندێکی تریش وایان لێك داوەتەوە و بۆچونیان وابووە: کە بەڕاستی لەو نەوانە بووە کە باوەڕی بە ئیبراهیم (عليه السلام) هێناوە و لەسەر دینەکەی شوێنی کەوتووە، هەروەها لە خاکی (بابل)یشەوە لەگەڵیدا کۆچی کردووە، کاتێك ئیبراهیم (عليه السلام) لەوێ کۆچی کرد.[٢٠]

(أبو إسحاق الثعلبي) بۆچونێکی جیاوازی لەوە باس کردووە کە (خضر) ئایا لە سەردەمی ئیبراهیمدا (عليه السلام) بووە یان دوای ئەو بووە بە ماوەیەکی زۆر.[٢١]

---

[19] – باپیری (منوشهر) بووە کە پاشای فارس بووە لە سەردەمی موسا(**عليه السلام**)دا.

[20] – تأريخ الطبري ١/١٨٨.

[21] – ئەم لێکدانەوە و بۆچونە پێشەوا (النووي) لە (تهذيب الأسماء واللغات)دا (١/١٧٧) هێناویەتی ،هەروەها (إبن حجر) لە (فتح الباري) (٦/٣٠٩)دا. لە پێشتر چەند وتە و بۆچونێك

هەروەها ئەوەیش هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە نەوەی ئیسرائیل بووە لە سەردەمی فیرعەوندا.[٢٢]

هەندێك لە خاوەن تەفسیرەکان دەڵێن: (خضر) و (الأسكندر المقدوني) دوو کوڕە پوور بوون، هەروەها وەزیریشی بووە، ئەوەیش بۆچونی هەڵە و نەفامانەیە، چونکە (الأسكندر) بە زیاتر لە هەزار ساڵ دوای موسا (عليه السلام) بووە! ئیتر چۆن دەبێتە کوڕە پوری و لە سەردەمی موسا پێغەمبەری خوادا؟!.[٢٣]

وتمان: هەندێك لە زانایانی تەفسیر وای دەبینن و بۆچونیان وایە، کە (ذا القرنين) بریتیە لە (الأسكندر المقدوني)....

ئەمەیش وتە و بۆچونێکە کە ڕاستی و بنەمای نییە.

(إبن جرير) دەڵێت: ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو لەپێش سەردەمی (أفريدون بن أثفيان)ەوە بووە هەتا گەیشتووە بە سەردەمی موسا (عليه السلام).

(إبن إسحاق) دەڵێت: پێم گەیشتووە کە خوای گەورە لە نەوەی ئیسرائیل پیاوێکی لە خۆیان کردە خەلیفە و جێنشین، پێی دەوترا:_ (ناشية بن أموص) ئینجا خوای گەورە (عزوجل) (خضر)ی بە پێغەمبەر بۆ ناردن....

(إبن جرير) وتوویەتی: نێوانی ئەم پاشا و جێنشینەی کە (إبن إسحاق) باسی کردووە و نێوانی (أفريدون) لە هەزار ساڵ زیاتر بووە. وتی: لە سەردەمی ڕۆژگارەکانی ئیبراهیمدا (عليه السلام)، پێغەمبەر نەنێردراوە. بەڵام لە سەردەمی (ناشية بن أموص)دا نێردراوە. پاشایەتی ئەم پیاوەیش لە

---

هاتن ،لە نێوانیاندا دەرکەوت کە (خضر) لەپێش ئیبراهیم (عليه السلام) لەدایك بووە ،سەیری (إرشاد الساري)(٥/٣٨٣) بکە.

22 – (البداية والنهاية) (١/٣٢٦) ووتراوە: لە پیاوە بەڕێزەکانیان بووە ،سەیری چیرۆکی ژیانی بکە لە کتێبی باسکراودا. ص/٣٢٧.

23 – سەیری (قصص الأنبياء)ی (عبد الوهاب النجار) ص/٢٩٦ بکە ط٣.

سەردەمی (بشتاسب بن لهراسب)دا بووە. و لە نێوان (بشتاسب) و (أفريدون)یشدا سەدە و سەردەمانێکی زۆر بووە.[٢٤]

هەروەها (عبد بن حميد) (إخراج)ی کردووە کە (خضر) پێغەمبەرێکی نێردراو بووە بۆ نەوەی ئیسرائیل، بە تازە کردنەوەی پەیمانی موسا، کاتێك کارەسات و ڕوداوەکان لەناو نەوەی ئیسرائیلدا گەورە بوون و (بختنصر) زاڵ بوو بەسەریاندا. (خضر) لەگەڵ ئاژەڵە کێویەکاندا بە زەویدا دەگەڕان، ئینجا خوای گەورەش تەمەنی بۆ درێژ کردەوە تا ئەو کاتەی خۆی ویستی کە خەڵکی دەیانبینی.[٢٥]

(إبن جرير) ئەوەی قبوڵ نەکردوە کە وتراوە: (خضر) ناوی (أورميا بن خلقيا) بووە، چونکە (أورميا) لە ڕۆژگارەکانی (بختنصر)دا بووە. نێوان سەردەمی موسا (عليه السلام) و (بُختنصر)یش لەو ماوانە بووە کە شارەزایانی بواری زانست و هەواڵ گێڕانەوە نەیانتوانیوە ئەندازەی بکەن و دیاری بکەن.[٢٦]

(الحافظ إبن عساكر) بە سەنەدێك لە (السدّي)ەوە گێڕاویەتییەوە: کە (خضر) و (إلياس) برا بوون و باوکیان پاشا بووە، ئینجا (إلياس) بە باوکی وت: بەڕاستی (خضر)ی برام حەزی لە پاشایەتی نییە، ئەگەر تۆ ژنێکی بۆ بهێنیت بەڵکو کوڕێکی لێ ببێت و ببێتە پاشا، ئینجا باوکی کچێکی گەنجی جوانی بۆ هێنا، ئینجا (خضر) بە ژنەکەی وت: بەڕاستی من پێویستم بە ژن نییە، ئەگەر دەتەوێت تەلاقت دەدەم و ئازادت دەکەم، ئەگەر دەشتەوێت بمێنیتەوە لەگەڵمدا، ئەوا بمێنەرەوە خوا بپەرستە و نهێنییەکانی من بپارێزە، ژنەکەیش وتی: باشە، بۆ ماوەی ساڵێك لای مایەوە کاتێك ساڵەکە

---

24 – تأريخ الطبري ١٨٨/١.

25 – الأصابة ١١٧/٢.

26 – تأريخ الطبري ١٩٤/١ سەیری چیرۆکی (أورميا) لە (العرائس)ی (الثعاليبي)دا بکە.

تەواو بوو پاشای باوکیان بانگی ژنەکەی کرد و وتی: بەڕاستی تۆ گەنجیت و کوڕەکەی منیش گەنجە ئەی بڕیار بووە کوڕتان ببێت لە کوێیە؟ ژنەکە وتی: بەڕاستی کوڕ لەلایەن خواوەیە. ئەگەر ئەو بیەوێت دەبێت و ئەو نەیەوێت نابێت. پاشان باوکی فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تەلاقی دا. پاشان ژنێکی تری بۆ هێنا کە بێوەژن بوو، منداڵی بوو بوو، کاتێك شەوی زاوایەتی چووە لای جاری پێشوو چی بە ژنی پێشوو وتبوو هەر هەمان شتیشی بەم وت، ئەویش بڕیاری دا بۆ ماوەی ساڵێك لای بمێنێتەوە، کاتێك ساڵەکە تێپەڕی و تەواو بوو، پاشا پرسیاری کرد دەربارەی کوڕ، ژنەکە وتی، بەڕاستی کوڕەکەی تۆ هیچ پێویستییەکی بە ژن نییە، پاشان باوکی داوای کوڕەکەی کرد کە بێت بۆ لای بەڵام ڕای کرد پاشان خەڵکی نارد بە دوایدا بەڵام نەیانتوانی دەستگیری بکەن... [27].

بۆچوونێکی نزیك لەمەوە لە تەفسیری (روح المعاني)دا هاتووە، کە (ابن عساکر) لە (اسباط)ەوە (اخراج)ی کردووە، ئەویش لە (السدّي)ەوە کە کوڕی پاشایەك بووە لە پاشایەتییەکە خۆی دابڕی بوو بۆ پەرستشی خوا، باوکی حەزی دەکرد ژنی بۆ بهێنێت ئەویش ڕەتی کردەوە پاشان وەڵامی دایەوە، پاشان ژنێکی گەنجی بۆ هێنا ساڵێك تێپەڕی نزیکی نەکەوتەوە، پاشان بێوەژنێکی بۆ هێنا نزیکی ئەویش نەکەوتەوە، پاشان هەڵهات و ڕای کرد، داوای کرد بیگرن بەڵام نەگیرا، پاشان ژنی یەکەمی شوی کرد و باوەڕی هێنا، کە قژ داهێنەری ژنەکەی فیرعەون بوو باسی ناوی باوکی نەکردووە.

---

[27] سەیری تەواوکاری چیرۆکەکە لە (البداية و النهاية) (٣٣١/١)دا بکە و (ابن کثیر) تعليقى لەسە نەداوە سەرەڕای ئەوەی کە بە سەنەدێکی (صحیح) ڕاست جێگیر نەبووە کە (خضر) برای (إلیاس) بوو بێت، سەیری ئەم گێڕانەوەیە لە تەفسیری (البحر المحیط ٦/ ١٤٧)دا بکە، کە زۆر بە کورتی هاتووە.

وتراوە: کوڕی فیرعەون بوو –لەسەر ئەوەی کە وترا بێت ئەو باوکی بووە– پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە زیندو لە مردوی بێگیان دەردێنێت و مردو لە زیندو دەردێنێت.[28]

هەروەها ئیمامی (القرطبي) هەندێك وتە و بۆچونی دەربارەی (الخضر) و سەرەتای ژیانی هێناوە، لەوانە: باوکی پاشا بووە و دایکیشی کچێکی فارس بووە ناوی (ألمى) بووە و لەناو ئەشکەوتدا بوویەتی، و لەوێ مەڕ و ئاژەڵی لێبووە هەموو ڕۆژێك لە شیری مەڕەکانی پێ دەدا کە هی پیاوی گوندێکی ئەو دەور و بەرە بوو، ئینجا پیاوەکە منداڵەکەی بردەوە و خۆی بەخێوی کرد، کاتێك پێگەیشت و بوویە لاو، پاشای باوکی داوای کەسێکی نوسەر و خوێندەواری کرد و کەسە خاوەن شارەزایی و زاناکانی کۆ کردەوە تا ئەو پەڕاوی (صحف) و نامانە بنوسنەوە کە بۆسەر ئیبراهیم و (شیث) دابەزی بوون، ئەو کەسەی کە لە نوسینەکەدا پێش هەموویان کەوت، (خضر)ی کوڕی خۆی بوو، ئەو نەیدەناسییەوە، کاتێك خەت و نوسینێکی زۆر جوانی هەبوو، گەڕا بە شوێن جوانی و ڕونی کارەکەیدا، ئینجا ناسییەوە کە کوڕەکەی خۆیەتی پاشان گرتییەوە لای خۆی و کردی بە سەرپەرشتیاری کار و باری خەڵکی پاشان (خضر) لە دەست پاشا هەڵهات لەبەر چەند هۆکارێك کە باسەکەی درێژە، تا سەرچاوەی ژیانی دۆزیەوە و لێی بەهرەدار بوو.[٢٩]

هەموو ئەم باسانە گێڕانەوەی مێژونوسان و خاوەن کتێبەکانن، و هیچ شتێك لەمانە پاڵپشتی زانستی نییە و بەڵگەی ڕاستیان لەسەر نییە. (خوا زاناترە).

---

[28] روح المعاني ١٥/ ٣١٩.

[29] – تفسير القرطبي ٤٤/١١

## بەشی سێیەم

## ئایا (خضر) پێغەمبەر بووە؟

وتەیەك دەربارەی ئەوەی کە لە فریشتە بووە:

وتراوە: کەسێکی خواناس و پیاوچاك بووە. واتە (ولي) هەروەها وتراوە: پێغەمبەر بووە، هەروەها وتراویشە لە فریشتەکان بووە![30]

بەڵام بۆچونی سێیەم غەریب و لاواز یان بەتاڵە.[31]

زانای تەفسیر (إبن کثیر) دەڵێت: ئەو وتە و بۆچونەی کە دەڵێت لە فریشتە بووە ئەوە زۆر غەریبە.[32]

پێشەوا (النووي) دەڵێت: وتراوە: فریشتەیەك بووە لە فریشتەکان ئەمە هەڵەیە.[33]

بەڕاستی زانای تێکۆشەر و گەورە (أبو الأعلی المودودي) لە بۆچونەکەیدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە.[34] ڕونی کردۆتەوە سێ کارەکەی (خضر) کە لە چیرۆکەکەدا هاتووە، چیرۆکی سێیەمیان لەگەڵ شەریعەتدا پێچەوانە نابێت، بەڵام چیرۆکی یەکەم و دووەم لەگەڵ بڕیارەکانی شەریعەتدا

---

30 – ئەو وتەیەی کە دەڵێت لە فریشتەکان بووە ئەوە دەگەیەنێت کە لە نەوەی ئادەم نەبووە. ئەمە گێڕانەوەی ئیمام (السهيلي)یە سەیری (فتح الباري ٣٠٩/٦) و (إرشاد الساري ٣٨٤/٥) بکە.

31 – صحيح مسلم بشرح النووي ١٣٦/١٥ و فتح الباري ٣١٠/٦.

32 – البداية والنهاية ٣٢٨/١.

33 – سەیری (المجموع شرح المذهب)ی ئیمامی (نووي) (٣٠٥/٥) بکە.

34 – سەیری تەفسیری سورەتی(کهف و مريم)ی (المودودي) تعريب احمد إدريس، لاپەڕە (٥٦) و دواتر بکە...

پێچەوانە دەبێت و گومانی تێدا نییە کە ئەوانە بڕیاری جێگیر و چەسپاون لە شەریعەتە خواییەکاندا، لەو کاتەوە کە دروست کراوەکان و مرۆڤ بەدیهاتوون ئەوانە چەند کارێك بوون بە فەرمانی خوا و بە دڵنیایی تەواوەوە ئەنجامی داون.

پاشان باسی ئەوەی کرد کە جۆری ئەم بڕیارانە شەرعی نین، بەڵکو ئەم بڕیارانە دەشوبهێن بە بڕیاری (خَلقي) کە بە ویستی خۆیان لە هەموو کاتێکدا ڕوو دەدەن، کەسێك توشی نەخۆشی دێت و کەسێکی تر تەندروستی و لەشساغی پێ دەبەخشرێت و سێیەم دەمرێت...هتد.

وتی: ئەگەر بڕیارەکان (خَلقي) بن ئەوا قسە لەگەڵکراو دەبێت فریشتە بێت، ئەوا پرسیار ناکرێت لە ڕێگە پێدان یان ڕێگە پێنەدانی شەرعی چونکە فریشتەکان بە خوود و ویستی خۆیان کار و هەڵس و کەوت ناکەن، بەڵکو تەنها فەرمانی خوایی جێبەجێ دەکەن، ئەگەر ئینسان ببێتە هۆکار بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارێکی (خَلقي) بەبێ ویستی خۆی، یان زانستێکی غەیبی و بڕیارێکی لەم جۆرەی پێ بدرێت و پاشان جێبەجێی بکات ئەوا هەردووکی وەك یەکە، چونکە ناگونجێت ئینسان بە حاڵی خۆی لە تاوان دەرچێت، کاتێك شتێکی جێبەجێ کرد پێچەوانە بێت لەگەڵ بڕیارێکی شەرعیدا، چونکە ئینسان بە سیفەتی خۆی ئینسانە و بە بڕیارە شەرعییەکان تەکلیف کراوە.

پاشان نادروستی کاری بە ڕێگای ئیلهام ڕوون کردۆتەوە کە پێچەوانەی دەقێکی شەرعی بێت و دەڵێت: ئایا خۆمان تەسلیمی ئەوە بکەین کە تەنها کەسێك -کە گەورەمان (خضر)ە- لەو یاسا گشتییە جیاکرابێتەوە؟ یان وای لێکبدەینەوە کە (خضر) لە (بشر) نییە و بەڵکو بەندەیەکە لە بەندەکانی خوای گەورە کە بە ویستی خوا کار دەکەن نەك بە پێی شەریعەتی خوا؟

ئیمە خۆمان دەدەینە دەست فەرمانی یەکەم، ئەگەر هات قورئان وای دەربڕی بوو کە ئەو بەندەیە، کە موسا نێردرا بۆ لای لە پێناو ئەو ڕێکخستەنەدا کە بەشەر بووبێت، بەڵام قورئان ئەوەی دەرنەبڕیوە کە (بشر) بووە، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿عَبْدًا مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو بەندەیە بە یەکلایەنە (بشر) بووە.

قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێندا ووشەی (عبد)ی بۆ فریشتەکان بەکارهێناوە.

بۆ نمونە لە سوورەتی: (الأنبیاء)دا فەرموویەتی:﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ﴾(الأنبیاء:٢٦).

واتە: (خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون).

هەروەها لە سوورەتی (الزخرف)دا فەرمویەتی: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا﴾(الزخرف:١٩).

واتە: (ئەو خوانەناسانە، فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بە کچی خوایان دەدایە قەڵەم!!).

هەروەها لە پێغەمبەریشەوە ﷺ فەرمودەیەکی ڕاست نەهاتووە ئەوەی دەربڕیبێت کە (خضر) لە (بشر) بووە. ئەوەی کە بەڕاست لەم بابەتەدا هاتبێت ئەو فەرمودانەن کە پێشەوایانی فەرمودە گێڕاویانەتەوە لە (سعید بن جبیر و إبن عباس و أبي بن کعب) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە تەنها ئەوە دەربارەی (خضر) وتراوە کە (رجل) بووە، کە ئەمەیش ووشەیەکە لەگەڵ ئەوەی کە تەنها بۆ نێرینەی (بشر) بەکاردێت، ئەوەش تەنها تایبەت نییە بەوان بەڵکو قورئانی پیرۆز ئەو وشەیەی بۆ پەری (جن)ەکانیش بەکارهێناوە، وەك لە سوورەتی (جن)دا فەرموویەتی:﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾(الجن:٦).

واتە: (بەڕاستی پیاوانێك لە دەستەی ئادەمیزاد پەنایان دەبرد بە پیاوانێك لە دەستەی پەرییەکان (پەرییەکان ئەمەیان بە هەل زانی) کەچی ئەوەندەی تر ماندویان کردن ((بەخورافات و شتی بێ سەرو بەر)).

هەروەها ئەوەیش شتێکی ئاساییە کە پەری یان فریشتە یان هەر دردروستکراوێکی غەیبی کاتێك خۆی نیشانی ئینسان دەدات لە شێوەی (بشر)دا خۆی نیشان دەدات، ئەو کاتەیش پێی دەوترێت ئەوە (بشر) یان (إنسان)ە و بەس، کاتێك فریشتەکە هاتە لای خاتوو (مریم) قورئان دەفەرموێت: ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾(مريم:١٧).

واتە: (جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای، وەکو بەشەرێکی تەواو ((خۆی خستە بەرچاوی)).

فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی موسا (عليه السلام) و لاوەکە {...حتى إنتهيا إلى الصخرةِ فإذا رجلٌ مسجى بثوبٍ} ئەمەیش بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە (خضر)، (بشر) بوو بێت.

پاش ئەمە تەنها یەك ڕێگەمان بۆ دەمێنێتەوە بۆ لابردنی (إشكال) ئاڵۆزی و گرفت لەسەر چیرۆکەکە ئەویش خۆمان بدەینە دەست ئەوەی کە (خضر) (بشر) نەبووە، بەڵکو فریشتە بووە یان هەر دروستکراوێکی تر لە دروستکراوەکانی خوای گەورە کە لەژێر ویستێکدا کاری کردووە کە بە شەریعەت تەکلیف نەکراوە.

ئەمەیش (المودودي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هێناویەتی کە لەو بەڵگانەیە کەوای دەبینین دوورە و لە هەمان کاتدا قورسە....

لێرەدا شتێك نییە ئەوە پێویست بکات کە لە غەیری (ئینسان) بوو بێت، لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆی ئاگاداری کردووە لەو مەسەلانە لە زانستی غەیبدا، کە موسای بەندەی خۆیی لێ ئاگادار نەکردووە.

ئایا لە کۆتایی چیرۆکەکەدا (خضر) ئەوەی دەرنەبڕیوە کە ئەو کارانەی بە ویستی خۆی ئەنجام نەداوە بەڵکو ئەوانە فەرمانی خوا بوون؟
بەڵکو ئەم ئاگادار کردنەوەیە لە سەرەتای چیرۆکەکەوە هاتووە کاتێك خوای گەورە ئەوەی فەرموو کە ڕوونی کردەوە بەندەی خۆی (خضر)ی بە زانستێك لە لایەن خۆیەوە و بە نهێنی پێغەمبەرایەتی تایبەتمەند کردووە کە موسا (علیه السلام)ی لێ ئاگادار نەکراوە.
خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(الكهف:٦٥).

واتە:(لە ڕەحمەتی تایبەتی خۆمان بەهرەوەرمان کرد بوو و زانست و زانیاری تایبەتی خۆمانمان پێ بەخشی بوو).
ئایا نهێنییەکە لە کوێدا دەشاردرێتەوە ئەگەر لە (بشر) بوو بێت و ئەو کارانەیشی کە کردونی بە فەرمانی خوای گەورە بوون؟!.
ئیمامی (المودودي) و کەسانی تریش ئەوەیان لە بیر چووە کە لەم فەرمودەیەدا هاتووە، کە ئیمامی (بخاري و مسلم) ڕیوایەتیان کردووە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {قَامَ مُوسَى (عليه السلام) خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ فَسُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ أَنَا أَعْلَمُ. قَالَ: فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ...}.
ئەم بەشەی فەرمودەکە:{ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟}.

واتە: لە (إنس) ئینسان، ئەمە بریتییە لە لابردنی (إشكال) گرفت و ئاڵۆزی لەسەر (العبد). خوای گەورە ئەوەی بۆ موسی (علیه السلام) بەندەیە کە لە (إنس) ئینسانەکانە.
ئەوە بە بیر و خەیاڵدا نایەت کە موسا (علیه السلام) بڵێت: من لە هەموو خەڵکی زاناترم، پاشان لەپڕ ئەوە دێتە پێش کە خوای گەورە دەینێرێت بۆ لای یەکێك لە فریشتەکان، کە لەو زاناترە.

لێرەدا ئەوەیش نایەت کە جیاوازی لە نێوان زانستی دوو کەسدا بکرێت کە ڕەگەزەکانیان جیاواز بێت، ئەوا حیکمەتی پێویست و خوازراو بەدەست نایەت لە چیرۆکەکەدا ئەگەر وتمان (خضر) فریشتەیە!
کەواتە پێویست ناکات بە شوێن (تأويل)ی دووردا بگەڕێین...کارەکە لەسەر شێواز و ڕواڵەتی خۆی دەمێنێتەوە ئەگەر (نص) دەقێك نەبێت...و دەست نەکەوێت..
بەڵام دەربارەی ئەو وتەیەی کە کارەکانی (خضر) لە جۆرێك بووە کە پێچەوانە بووە لەگەڵ شەریعەتی خواییدا، زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتوون.

## بۆچوون لەسەر ئەوەی کە (ولي) خواناس و پیاو چاك بووە

زۆرێك بۆچونیان وایە کە پێغەمبەر (نبي)نەبووە، بەڵکو (ولي) خواناس بووە.[٣٥]
زۆرینەیش بۆچونیان وابووە کە (نبي) بووە، و غەیری ئەم زۆرینەش دەڵێن (رسول) بووە، کەسانێکی تریش دەڵێن: (ولي) بووە زۆرکەس لەسەر ئەم بۆچونەن.[٣٦]
(أبو القاسم القشيري) لە (رسالة)ەکەیدا، لە (باب إثبات كرامات الأولياء)دا دەڵێت:(خضر) (نبي) نەبووە، بەڵکو (ولي) بووە.[٣٧]
ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لای (صوفي)یەکان (ولي) بووە نەك (نبي) وەك خاوەنی (روح البيان) ڕونی کردۆتەوە.[٣٨]

---

35 – تفسير إبن كثير ٩٩/٣

36 – قصص الأنبياء لعبدالوهاب النجار ص٢٩٦ و في (غاية المأمول شرح التاج الجامع للأصول) أن الخضر نبي، أو ولي، و عليه الجمهور، سەیری (التاج الجامع للأصول ١٧١/٤ الهامش) بکە.

37 – الرسالة القشيرية (في علم التصوف) ص١٦١ هەروەها سەیری (حاشية العروسي على شرح زكريا الأنصاري للرسالة القشيرية ١٦١/٤) بکە.

38 – روح البيان في تفسير القرآن ٤٩٨/٢.

پێشەوا (النووي) دەڵێت: ئەمە –ئەم بۆچونەی کە دەڵێت (ولي) بووە– پێچەوانەی هەڵبژێردراوە.[٣٩]
پرسیار کرا لە زانای (فیقه) (محمد الرملي) دەربارەی فتوادانی لەسەر (خضر) (علیه السلام) فەرمووی: بەڕاستی ئەوەیە کە (جمهور) زۆرینەی زانایان دەیڵێن، کە (نبي) بووە لەبەر ئایەتی: ﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾(الكهف:٨٢).
هەروەها ئایەتی: ﴿آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾(الكهف:٦٥).
واتە: وەحی و پێغەمبەرایەتی لەگەڵ ئەوەی کە هەندێکیان ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەبووە و وتویانە: (نبي)نەبووە.[٤٠]

## (نبی) یان (رسول)؟

(شیخ أبو عمر بن الصلاح الکردي) لە فتواکانیدا دەڵێت: (خضر)، (نبي) بووە و ڕا و بۆچونیان جیاواز بووە لەوەدا کە (رسول) بوو بێت.[٤١]
پێشەوا (النووي) دەڵێت: ئەوەی کە (الأکثر) زۆرێکی لەسەرە، ئەوەیە کە (نبي) بووە، وتراویشە: (نبي رسول) بووە.[٤٢]
(إبن عباس) و (وهب بن منبه) دەڵێن: (نبي) بووە نەك (مرسل)، هەروەها لە (إسماعیل بن أبي زیاد) و (محمد بن إسحاق) و هەندێك لە خاوەن کتێبەکانەوە هاتووە کە پێغەمبەر بووە و بۆ قەومەکەی نێردراوە و ئەوانیش

---

39 – بستان العارفین للنووي. ص١١٥

40 – سەیری (الدرر النقیة في المطالب الفقهیة).ص١٤٢. بکە.

41 – (النبي) کەسێکە وەحی بۆ دەکرێت، هەروەك چۆن وەحی بۆ (الرسول) دەکرێت، بەڵام ئەوەندە هەیە کە فەرمانی پێ ناکرێت ڕایبگەیەنێت، بەڵام (الرسول) فەرمانی پێ کراوە ڕایبگەیەنێت، هەموو (رسول)ێك (نبي)یە، بەڵام بە پێچەوانەوە نا. سەیری (النهایة)ی (إبن الأثیر ١٢٠/٤) و هەروەها (تحفة المرید علی جوهرة التوحید للبیجوري) ص/٦ ط١٣٥٨ه. بکە.

42 – بستان العارفین ص١١٥.

وەلاّمیان داوەتەوە، (أبو الحسن الرماني) پاشان (إبن الجوزي) پشتیوانی ئەم بۆچونە دەکەن.[٤٣]

هەروەها خاوەنی (الفتوحات المكية) لە وتەکانیدا لە (حياة الأنبياء) ژیانی پێغەمبەراندا، باسی (الخضر)ی کردووە و ڕوونی کردۆتەوە کە (رسول) بووە، ئەوە نەبێت کە زانا (الآلوسي) ئەم وتەیەی بە شوێندا هێناوە: ئەم وتەیە دەری دەخات (خضر) (**عليه السلام**) پەیامدار بووە، ئەمەیش وتەیەکی بەهێزە لای زانایان.[٤٤]

ڕەنگە بۆچونەکە بەوەیشەوە نەوەستێت کە پەیامدارە، چونکە ئەگەر زیندو بێت —لەسەر قسە و بۆچونی ئەو کەسانەی کە دەڵێن لەژیاندا ماوە— ئەوا پێویستە لەسەری کە پەیامەکەی بگەیەنێت، وەك ئەوەی کە ئەوە کاری پێغەمبەرانە. ڕێك کەوتوون کە ئەو ڕاینەگەیەنێت، کەواتە (رسول) نەبووە.

## بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی (خضر) و بەڵگە لەسەر (ولي) بوونی

(أبو إسحاق الثعلبي) دەڵێت: (خضر) لەسەر هەموو وتە و بۆچونەکان (نبي) بووە و تەمەنێکی دیاریکراوی هەبووە، و لەبەرچاو شاراوە و وون بووە.[٤٥]

لەسەر بۆچونی (مشهور) بەناوبانگ (نبي) بووە.[٤٦]

هەروەها لای زۆرینەی زانایانی تریش.[٤٧]

---

43 – الإصابة ٢/١١٦.

44 – روح المعاني ١٥/٣٢٩

45 – سەیری (شرح صحيح مسلم) ١٥/١٣٦ و بسان العارفين ص١١٥ بکە.

46 – سەیری (أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب لمحمد إبن السيد درويش ص٢٩٦-٢٩٧) بکە، هەروەها (روح البيان)١٥/٣٢٠.

47 – روح البيان في تفسير القرآن ٢/٤٩٨.

زانایانی تەفسیر بۆچونیان وایە کە وشەی ﴿رحْمَةً﴾ لە ئایەتی: ﴿آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾(الكهف:٦٥)دا، پێغەمبەرایەتی دەگەیەنێت. زۆرینەیش لەسەر ئەوەن.[٤٨]

زانای تەفسیر (النسفي) ئەم ئایەتەی: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ بە مانای (هەواڵدان بە غەیب) تەفسیر کردووە. وتراوە: (العلم اللدني). لە کۆتایی چیرۆکەکەیشدا ئەم ئایەتە دێت:﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾.

واتە: (ئەو کارانەی کە تۆ بینیت من لە هەوڵ و تێکۆشانی خۆمەوە ئەنجام نەدا، بەڵکو بە فەرمانی خوای گەورە ئەنجامم دا.[٤٩]

زانای تەفسیر (القرطبي) دەڵێت: لای (جمهور) زۆرینە (نبي) بووە، ئایەتەکەیش شایەتی ئەوە دەدات، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کەسێك لە خوار خۆیەوە فێر نابێت، هەروەها چونکە بڕیاردان بە نهێنی و شارەوەکان کەسێك لە پێغەمبەران نەبێت لێی ئاگادار نابێت.[٥٠]

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە (نبي) بووە بریتیە لەوەی کە وەحی بۆ کراوە، بەوەی کە لە موسا (علیه السلام) زاناتر بووە. ئەوە بە دوور دادەنرێت کە (ولي) لە (نبي) زاناتر بێت.[٥١]

بەڵگەی تر لەسەر ئەوە هاتوون کە (خضر) پێغەمبەر بووە، لەوانە:

١- ئایەتی: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا﴾ ئەم (الرحمة)یە ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتییە، کە خوای گەورە پێی داوە.

(خضر) ئەو ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتییەی کە پێی بەخشراوە، دڵنیای دەکاتەوە، لە شیکردنەوەی کارەکانیدا بە موسای وت: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾، واتە

---

48 – سەیری (الكشاف)ی (الزمخشري ٥٧٥/١) و (روح المعاني ٣٢٠/١٥)بکە.

49 – تفسير النسفي (سورة الكهف آية:٨٢)

50 – سەیری (فتح الباري) ٣١٠/٦ بکە.

51 – صحيح مسلم بشرح النووي ١٣٨/١٥.

من ئەم سێ کارەم کرد، کە وەکو ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لە لایەن پەروەردگارتەوە.

٢- هەروەها ئایەتی: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ خوای گەورە لە زانستی هەندێك کار ئاگادار و شارەزای کردبوو، و هەواڵی شاراوەکانی هەندێك لە شتەکانی پێ وتبوو.

ئەو زانستە (لدن)ییەش لەم ئایەتەدا زانستی پێغەمبەرایەتی بووە.

٣- قسەکەی موسا (**علیه السلام**) بۆ ئەو: ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ ئەگەر پێغەمبەر نەبووبێت، موسا داوای لێ ناکات لێوەی فێری زانست ببێت. و بەم شێوازە لەگەڵی نەئەدوا و تکای لێ نەدەکرد و تەسلیمی نەدەبوو، ئەم گفتوگۆیەش لە نێوانیاندا ڕووی نەدەدا.

٤- ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە، (معصوم) پارێزراو نەدەبوو، واتە ڕەنگ بوو لە هەندێك کاریدا تووشی هەڵە ببوایە، ئەگینا چۆن پێغەمبەرێکی (معصوم) پارێزراو شوێنی دەکەوێت و دەیەوێت لێوەی فێر ببێت؟ ئەگەر لە کارێکدا هەڵە بکات، ئیتر چۆن شوێنپێی هەڵبگرێت؟ تەنها پێغەمبەران پارێزراون.

٥- پێش دەستی کردنی (خضر) بۆ کوشتنی منداڵێك، بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی، چونکە کوشتنی نەفسێك بە بێ حەق کارێکی ڕێپێدراو نییە، ئەگەر ئەو پێغەمبەر نەبوبێت، بە کافر بوونی ئەو منداڵەی نەدەزانی، و بە تایبەت کە موسای لەگەڵدایە و پێغەمبەریشە، بە کافری منداڵەکەی نەزانیوە، پاشان ڕونکردنەوەی (خضر) بۆ (موسی) بەوەی کە لەبەر کافر بونەکەی کوشتویەتی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هەواڵی پێداوە و، فەرمانی پێ کردوە.

٦- (خضر) پاش ئەوەی کارەکانی ڕون کردەوە بە موسای وت: ﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ واتە: من بە کار و فەرمان و عیلمی خۆم ئەم کارانەم نەکردوە لە خۆمەوە، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم، کە ئەوەیش لە ڕێگای

(وەحی)یەوە بوو.

٧- گلەیی خوا لە موسی (علیه السلام) کاتێك وتی: من لە هەموو کەس زاناترم، خوای گەورە پێی فەرموو: (بەندەیەك هەیە لە شوێنی بە یەکگەیشتنی دوو دەریاکە، ئەو لە تۆ زاناترە)، (خضر) لە (موسا) زاناتر بوو، لەو مەسەلانەدا. کە ناگونجێت (الولي) خواپەرست لە پێغەمبەر زیرەکتر بێت.

٨- قسەکەی (خضر) بۆ موسا (علیه السلام): من لەسەر زانستێکم لەلایەن خواوە، کە فێری کردووم کە تۆ نایزانیت، و تۆیش لەسەر زانستێکیت کە خوا فێری کردویت، کە من نایزانم.[٥٢]

(إبن کثیر) لە تەفسیری ئایەتەکەی پێشودا دەڵێت: واتە من فەرمانم پێکرا و هەڵوێستەم لەسەر کرد، ئەمەیش بەڵگەی تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن (خضر)، (ولي)بووە.[٥٣]

بەڵام ئەوانەی کە بۆچونیان وا بووە (خضر)، (ولي) بووە، ئەم ئایەتە بەوە تەفسیر دەکەن کە ڕەنگە چووبێتە خزمەت یەکێك لە پێغەمبەرانی ئەو زەمانە، ئەویش فەرمانی ئەوەی بە (خضر) کردبێت.[٥٤] یان ئەوەتا (ما) لە ئایەتەکەدا (موصولة)یە و (نافية)نییە، و وشەی (أمر)یش واتە (شأن) ماناکەی بەم جۆرەی لێ دێت: (والذي فعلتُهُ مِن شأني) واتە: (ئەو کارەی کە کردم لە خۆم و ویستی خۆمەوە بوو) چونکە ئەو کارانە لە بڕیارەکانی ڕۆحی ئیلهامی (ولي) خواناسەکانن.[٥٥]

(إبن کثیر) لە ڕونکردنەوەی بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەیدا دەڵێت: چیرۆکەکە لە چەند ڕوویەکەوە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی کە (نبي) پێغەمبەر بووە:

---

٥٢- ( مع قصص السابقين فی القرآن) ل ( ٣٩٩ – ٤٠٠).

53 – تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣/٩٩.

54 – إرشاد الساري ٥/ ٣٨٤ و صحيح مسلم بشرح النووي ١٥/١٣٦.

55 – ئەمە (شيخ علي بن محمد وفا) ووتویەتی سەیری (الطبقات الكبرى للشعراني) ٢/٢٦ بکە.

**یەکەم:** دەفەرموێت: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(الكهف:٦٥).[٥٦]

---

[56] – لە زۆر شوێندا ووشەی (رحْمَة) بە مانای (النبوة) هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا، لێرەدا هەندێك لەو ئایەتانە و تەفسیرەکانیان لەبەر گرنگی باسەکە دەهێنین، و لەبەر ئەوەی کە زۆرینەی ئەو کەسانەی کە پاڵپشتی لە پێغەمبەرایەتی (خضر) دەکەن، دەست بەم بەڵگانەوە دەگرن:

– خوای گەورە فەرمویەتی:﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ﴾(هود:٢٨).

زانا (الآلوسی) دەڵێت: ئەوە بریتیە لە (النبوة) پێغەمبەرایەتی، لەسەر ئەوەی کە لە (إبن عباس)(علیهما السلام) ریوایەت کراوە، (روح المعانی: ٣٩/١٢)، (إبن كثیر) دەڵێت: واتە: لەسەر دڵنیایی و فەرمانێکی روون و پێغەمبەرایەتی راست، کە ئەوەیش رەحمەت و میهرەبانییەکی گەورەیە لە لایەن خواوە بەوان، تفسير القرآن العظيم: ٤٤٣/٢.

– خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا﴾(مریم:٢١) واتە: ئەم منداڵە دەکەین بە رەحمەت و بەزەیی لە لایەن خواوە. هەروەها پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران کە بانگەواز بکات بۆ خوا پەرستی و یەکخواناسی. (تفسیر إبن كثیر: ١١٥/٣).

– خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ﴾(البقرة:١٠٥). لێرەدا مەبەست لە (الخیر) یان (الوحی) وەحی یان (قورئان) یان (النصر) سەرکەوتنە، و مەبەست لە (رحْمَة)یش ئەو (خیر)ەیە. (روح المعانی: ٣٥٠/١)، لە تەفسیری (النسفی)دا واتە: بەڕاستی ئەوان خۆیان وا دەبینن کە شیاوتر بن وەحییان بۆ بێت، ئەوان حەسودیتان پێ دەبەن و حەز ناکەن شتێك لە (وحی) بۆ سەر ئێوە دابەزێت، خوای گەورەیش خۆی هەر کەسی بوێت تایبەتی دەکات بە پێغەمبەرایەتی.

– خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَدْخَلْنَاهُ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾(الأنبیاء:٧٥). واتە:خوای گەورە زانست و دەسەڵاتی پێ دەبەخشێت و وەحیشی بۆ نارد و کردیە پێغەمبەر. (تفسیر إبن كثیر: ١٥٨/٣).

– خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾(الكهف:٨٢). وشەی (رحْمَة) واتە:(الوحی) واتە: بە رەحمەت و میهرەبانی پەروەردگارت و بە هۆی (وحی)یەوە، ووتەکە بەم جۆرەی لێ دێت:(وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي)، واتە: بە بۆچونی خۆم و هەوڵ و تێکۆشانی خۆمەوە، بۆ دڵنیایی ئەمە (روح المعانی: ١٤/١٦).

– خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾(آل عمران:٧٤). واتە: بە پێغەمبەرایەتی یان ئیسلام، وەك لە تەفسیری (النسفی)دا هاتووە.

**دووەم:** قسەکەی موسا (علیه السلام) بۆ (خضر): ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾(الكهف:٦٦)، خۆ ئەگەر (ولي) وا بوایە، ئەوا موسا (علیه السلام) بەم جۆرە وت و وێژی لەگەڵ نەدەکرد، ئەویش ئەو وەڵامەی موسای نەدەدایەوە، بەڵکو موسا داوای کرد هاوڕێیەتی بکات، تا لەو زانستەی لای ئەوە، ئەویش بەهرەدار بێت، کە خوای گەورە (خضر)ی پێ تایبەت کردووە، ئەگەر پێغەمبەر نەبوایە، ئەوا (معصوم) پارێزراو نەدەبوو، ئەوا بۆ موسایش نەبوو–کە پێغەمبەر و نێردراوێکی گەورە و بەڕێزە و پارێزراوە– زۆر حەزی لە زانستی (ولي)یەك بێت کە (معصوم) نییە، کاتێك بڕیاری دا بچێت بۆ لای و لێی بکۆڵێتەوە..، پاشان کاتێك لەگەڵیدا کۆبویەوە، ملکەچی خۆیی بۆ نواند و بە گەورەی زانی و شوێنی کەوت بە شێوەیەك کە لێی سودمەند بێت، هەموو ئەمانەیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرێك بووە لە شێوەی ئەو، وەحی بۆ کراوە و بەڕاستی (خضر) تایبەتمەند کراوە بە زانستی (لدني) و نهێنی پێغەمبەرایەتی، بە جۆرێك کە خوای گەورە موسای لەوە ئاگادار

---

– خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾(الزخرف:٣٢) واتە: پێغەمبەرایەتی، تەواوکەری ئایەتەکە بریتیە لە: ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ واتە: لە کاتێکدا ئێمەین کە ڕزق و ڕۆزیمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لە ژیانی دونیادا و پلە و پایەی هەندێکیمان بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، بۆ ئەوەی هەمووان کار و باری یەکتر تەواو بکەن و کەڵك لە توانایی و لێهاتوویی یەکتر وەربگرن، جا لەگەڵ ئەو هەموو بەهرە و بەخششانەدا ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ (کە تایبەتی ئیماندارانە لە قیامەتدا) لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵ و سامان و هۆکارەکانی ڕابواردن) چاکتر و بەنرخترە. (تەفسیری ئاسان: ل/٤٩١).

– هەروەها خوای گەروە فەرمویەتی: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾(الدخان:٦) پێشەوا (النفسی) دەڵێت: (الرحمة)ی بە (الأرسال) ناردن وەسف کردووە، هەر وەکو لەم ئایەتەدا وەسفی کردووە: ﴿فَلَا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ﴾(فاطر:٢).

نەکردووە. موسایش ناسراوە بە(کلیم) و پێغەمبەرێکی بەڕێزی نەوەی ئیسرائیلە.

<u>سێیەم:</u> بەڕاستی (خضر) دەستپێشکەری کرد لەسەر کوشتنی ئەو منداڵە ئەوەیش نابێت مەگەر بە هۆی وەحی لەلایەن خوای زاناوە. ئەمەیش بەڵگەیەکی سەربەخۆیە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی. هەروەها بەڵگەیەکی دیار و ڕونیشە لەسەر (معصوم) بوونی، چونکە (ولي) ڕێگەی پێ نادرێت دەست پێشکەری بکات بۆ کوشتنی نەفسێك تەنها بە ویستی خۆی، چونکە ئەو ڕازەی ئەو ناچێتە بواری (معصوم) بوونەوە، دەگونجێت هەڵەی لێ بووەشێتەوە، کاتێك (خضر) دەست پێشکەری کرد بۆ کوشتنی منداڵەکە، کە هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی پێگەیشتن، ئەو زانستی هەبوو کە لە داهاتوودا گەورە بوو کافر دەبێت، و دایکی و باوکی هەڵدەنێت بەرەو کافر بوون لەبەر خۆشەویستی زۆریان بۆی، شوێنی دەکەون.. لە کوشتنەکەیدا بەرژەوەندییەکی گەورە هەبوو، کە بە پاکی دەمێنێتەوە و پاراستن دەبێت بۆ دایك و باوکی لەوەی کە بێ باوەڕ بن، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی، هەروەها لە لایەن خواوە بە (معصوم) پارێزراوی پاڵپشتی کرا بوو.[57]

<u>چوارەم:</u> کاتێك (خضر) لێکدانەوەی کارەکانی بۆ موسا شی کردەوە و ڕاستی و حەقیقەتی کارەکان ڕوون بوویەوە و دەرکەوت، دوای ئەوە فەرمووی: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾. واتە: من لە خۆمەوە ئەم کارانەم ئەنجام نەداوە، بەڵکو فەرمانم پێکراوە و وەحیم بۆ کراوە دەربارەیان.

---

[57] – (إبن کثیر) دەڵێت: من (الشیخ أبا الفرج بن الجوزي)م بینی کە لەم ڕێڕەوەی دەدا و دەکۆڵیەوە بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر پێغەمبەرێتی (خضر) و بە ڕاستی دادەنا، هەروەها (الرماني)یش بەڵگە هێنانەوەکانی گێڕاوەتەوە. سەیری (البدایة والنهایة) ١/٣٢٨بکە.

(إبن كثير) دەڵێت: ئەمە نەفی ئەوە ناکات کە (ولي) بووە، هەروەها نەفی ئەوەیش ناکات کە پەیامی بۆ هاتبێت، وەك هەندێك بۆچونیان وابوو.[٥٨]

هەروەها دەڵێت: ئەگەر ئەوە جێگیر بوو چەسپا کە پێغەمبەرە، وەك باسمان کرد، ئەوا سەنەد و پاڵ پشتێك بۆ ئەو کەسانە نامێنێتەوە پشتی پێ ببەستن و بە بەڵگە بیهێننەوە کە بڵێن: (ولي) بووە، بە تایبەتی کە (ولي) هەندێك کات ئاگادار دەبێت لە ڕاستی کارەکان بەبێ بوونی هۆکاری شەرعی ئاشکرا.[٥٩]

## لێکۆڵینەوە و ئەنجام

بەڵگەی ئەوانەی کە نەفی پێغەمبەرێتی (خضر) دەکەن –کە کەسانێکی کەمن– بە بەڵگەی بەهێز دانانرێت لەبەردەم جێگیر کردنی بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەیدا، و کارێکی قورس و گرانیش نییە کە دەستەی دووەم بەڵگەکانیان ڕەت بکەنەوە.

لە بۆچونی ئەو کەسانەیش کە دەڵێن: (خضر)، (ولي)بووە، دەڵێن: بەڕاستی ئەو شتانەی کە ڕویداوە لە سەرسوڕهێنەرەکان بووە لە چیرۆکی (خضر) لەگەڵ موسادا (عليه السلام) یان فێرکردنی موسا پێغەمبەر بووە، یان ئیلهام بووە.

ئەگەر دانانێك هەیە ڕەنگە پێغەمبەرێك هەبوو بێت کە لە ڕێگەی وەحییەوە فەرمانی ئەوەی پێ کردبێت.... ئەوەیش بە دوور گیراوە، چونکە لە وەسفیدا

---

[58] – واتە بوونی (ولي) و (کرامات) لە (خضر)دا، ئەوە ناگەیەنێت (ولي) بووبێت و پێغەمبەر نەبوو بێت، بەڵکو ئەوە دەچێتە ناو موعجیزەی پێغەمبەرانەوە.

[59] – البداية والنهاية: ٣٢٨/١ بەکەمێك دەسکاییەوە.

شتێکی وا نەهاتووە وەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(الكهف:٦٥).

ئەمیش سوود و گرنگی و وانەی زۆری تێدایە. بەڵکو هەندێك جار دەوترێت: چ سودێك لەم زانستە (لدني)یەدا هەیە کاتێك (خضر) پێویستی بەوە هەیە کە ئەو شتە سەیر و عەجیبانە پیشانی موسا (عليه السلام) بدات، تا پەیوەندی و نێوەندێك لە نێوان خۆی و پێغەمبەرێکی وەك خۆیدا دروست بکات.[٦٠]

ئەو کەسەیش کە دەڵێت: ئەو کارە لە ئیلهامەوە بووە، ئەوا قسە و بۆچونەکەی ئەوە پێویست دەکات کە ئیلهام و بەڵگە بووە لە هەندێك لە شەریعەتەکاندا، و (خضر)یش یەکێك بووە لەو کەسانەی کە لەژێر تەکلیفی ئەو شەریعەتانەدا بووە، خۆ ئەگەرنا ئەوا وا دەردەکەوێت کە ئیلهام بەڵگە نەبووە لە شەریعەتی موسا (عليه السلام) دا، هەر بەو جۆرەیش بە بەڵگە دانانرێت لە شەریعەتی ڕاستی خۆیشماندا، هەر کەسێکیش بڵێت ئەوە بەڵگەیە ئەوا پێویست دەکات پێچەوانە نەبێت لەگەڵ دەقی شەرعیدا، خۆ ئەگەر خوای گەورە هەندێك لە بەندەکانی ئاگادار بکات بە هۆی ئیلهامەوە، وەك نمونەی ئەوەی کە (خضر)ی ئاگادار کردووە لە حاڵی ئەو منداڵە، ئەوا کوشتنی حەڵاڵ نەبووە.[٦١]

پێشەوا (الفاروقي السهرندي)[٦٢] لە چەند شوێنێکی (مکتوبات)ەکانیدا دەری بڕیوە دەڵێت: بەڕاستی ئیلهام، حەرام حەڵاڵ ناکات و حەڵاڵ حەرام ناکات،

---

60 – روح المعاني ١٧/١٦ بە کەمێك دەسکاری کردنەوە.

61 – روح المعاني ١٧/١٦ بە دەسکارییەوە.

62 – ناوی (احمد)ی کوڕی (عبد الأحد)ی (الفاروقي)ی (السهرندي)یە، و (مجدد)ی هەزارەی دووەمە، یەکێکە لە زانا بانگخوازەکانی (هند) لە بەرهەمەکانی بریتیە لە: (رد الشیعة) و (المکتوبات) و (إثبات النبوة) لە ساڵی(١٠٣٤)ی هجری کۆچی دوایی کردووە.

لەمەیشەوە دەردەکەوێت کە (مخالفة) لە نێوان شەریعەت و حەقیقەت و (ظاهر) و (باطن)دا نییە.[٦٣]

ڕاستییەکەی بریتیە لەوەی کە لە کارکردن بە ئیلهام پشت نابەسترێت بە چیرۆکی (خضر)، مەگەر تەنها بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن (خضر) (ولي)بووە، وەك بینیمان ئەوە پێچەوانەی بۆچونی زۆرینەی زانایانە.

بەڕاستی ئیلهام لای (ولي)یەکان، بە بەڵگە دانانرێت و دروست نییە، پشتی پێ ببەسترێت لە کارەکانیاندا، کاتێك پێچەوانە بێت یان دژایەتی دەقێکی شەرعی بکات لەو کات و شوێنەشدا بۆ (خضر) ڕێگە پێدراو نەبووە کە لە ڕێگەی ئیلهامەوە بەو کارانە هەڵسێت....

ئەوەیش -بەهۆی هێناوەی بەڵگەکانەوە- بەتاڵ دەبێتەوە، ئەمە لە بۆچونی ئەوکەسانەدا کە دەڵێن: (ولي)بووە. تەنها ئەوە دەمێنێتەوە کە ئەو کارانەی بە ڕێگەی وەحی خوایی ئەنجامداوە...و پێغەمبەرانیش (معصوم)ن.[٦٤]

بەم جۆرە جیاوازی بیر و ڕاکە لەسەر پێغەمبەرایەتی تێپەڕی کردووە بۆ سەر تەفسیری ئایەتەکان کە لە باسی موسا و (خضر)دا (عليهما السلام) هاتوون، هەر کەس بۆچونی وا بووە کە (خضر) پێغەمبەرە ئەوا کارەکانی بەوە تەفسیر دەکات کە ئەو لە ڕێگەی وەحییەوە هەستاوە بە ئەنجامدانیان و بەڵگەیشی لەسەر دێنێتەوە، و هەر کەسیش وای ببینێت کە (ولي) بووە، ئەوا تەفسیر و لێکدانەوەی تری بۆ دەکات....

---

[63] – روح المعاني ١٨/١٦ دەتوانیت بۆ ئەم باسە بە فراوانی سەیری کتێبی (قواعد التصوف على وجه يجمع بين الحقيقة و الشريعة) بە تایبەت ل١١٢، کە لە دانراوی (أحمد البرنسي المغربي) یە، بکەیت.

[64] – ئەو کەسانەی کە دەڵێن (ولي) لە پێش (نبي)یەوەیە، ئەوە بۆچونی (زنادقة)ەکانە، وەك یەکێك لەوان دەڵێت:

مقام النبوة في برزخ فويق الرسولِ و دون الولي! (الأصابة: ١١٦/٢).

بەڕاستی ئەوەی کە زۆر جێگەی ئاڵۆزییە لەم چیرۆکەدا کوشتنی منداڵەکەیە لەبەر ئەوەی کافر دەبێت، لەوە ترسا ئەگەر بە زیندویی بمێنێتەوە ببێتە هۆی هەڵگێڕانەوەی دایك و باوکی لە باوەڕەکەیان، ئەو تایبەتمەند بووە بەو کارە، چونکە هەر وەك (السبکي) دەڵێت: ئەو وەحی بۆ کراوە کە بە (باطن) شاراوە و جیاوازی (ظاهر) ئاشکرا و بە پێی حیکمەت کار بکات ئەوە گرفتی تیا نییە، بەڕاستی ئەوەیش لە شەریعەتی خۆماندا زانراوە، کە ڕێگا نادرێت و دروست نییە بۆ هیچ کەسێك -ئیتر هەر کەسێك بێت- منداڵێکی بچوك بکوژێت بە تایبەتی لە نێوان دایك و باوکێکی باوەڕداردا بێت، ئیتر چۆن ڕێگە دەدرێت بە کوشتنی کە هیچ هۆکارێکی لەسەر دەست نەکەوتبێت! لەدایکبوو(منداڵ) بە کوفری (حقیقي) و ئیمانی (حقیقي) باس ناکرێت، ئەمە بڕیار و ڕێککەوتنی حەق و شەریعەتەکانە، تا ئێستایش کەس لەو بڕیارانە دەرنەچووە، لە سەرو ئەوانەوە زانا شارەزاکان، ئەمە لەسەر ئەو بۆچونەی کە پێغەمبەر بوو بێت....

بەلام لە بارەی چاك کردن و ڕاستکردنەوەی دیوارەکە بە بێ کرێ ئەوە هیچ گرفتێکی تێدا نییە، چونکە بەڕاستی ئەوە چاکە کردنە با کارەکە بەو جۆرە چاکە بێت و هیچ زیانێکی تێدا نییە چونکە ئەوە لە ڕەوشتە بەرز و پیرۆزەکانە. بەلام دەربارەی عەیبدار کردنی کەشتییەکە بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە داگیرکردنی پاشای ستەمکار، وتویانە: بەڕاستی ئەوەیش لەو شتانەیە کە گرفتی تێدا نییە، تەنانەت (العز بن عبدالسلام) وتویەتی: بەڕاستی کاتێك ماڵی هەتیو یان کەسێکی بێئاگا و نا وریا یان شێت لەژێر دەستی ئینساندا بوو، ترسا لەوەی کە ستەمکارێك دەیبات، ئەوا پێویستە لەسەری کە عەیبداری بکات لەپێناو ئەوەدا کە بیپارێزێت....[٦٥]

---

[65] - سەیری (روح المعاني: ٢١/١٦)بکە بە کورتی و بە دەسکاری و بە لابردنەوە.

پێشەوا (إبن تيمية) ووتەیەکی بێهاوتای دەربارەی ئەم بابەتە هێناوە و دەڵێت: هەندێك کەس بە چیرۆکی موسا و (خضر) (عليهما السلام) بەڵگە دەهێننەوە وا گومان دەبەن کە (خضر) لە (شريعة) چۆتە دەرەوە، ئەوا ئەوە بۆ (ولی)یەکانی غەیر خۆی ڕێگە پێدراو دەبێت کە بۆ ئەو ڕێگەپێدراو بێت کە لە شەریعەت دەربچێت. ئەوا ئەوان لەم لێکدانەوە و گومانەیاندا لە دوو ڕووەوە گومڕان:

*یەکەمیان:* بەڕاستی (خضر) لە شەریعەت نەچووەتە دەرەوە بەڵکو ئەوەی کە ئەو کردویەتی لە شەریعەتی موسادا ڕێگە پێدراو بووە، چونکە کاتێك هۆکارەکەی بۆ موسا ڕوون کردەوە ئەویش دانی پیادانا، خۆ ئەگەر ڕیگە پێدراو نەبوایە ئەویش دانی پیا نەدەنا، بەڵام ئەوە هەبوو کە موسا (عليه السلام) ئەو هۆکارانەی نەزانیوە کە بۆ ئەو ڕیگە پێدراو بووە کە ئەو کارانە بکات، وا گومانی بردووە کە (خضر) وەك پاشایەکی ستەمکارە، ئینجا (خضر)یش ئەوەی بۆ باسکردووە.

*دووەمیان:* بەڕاستی (خضر) لە ئوممەتی موسا (عليه السلام) نەبووە، هەروەها پێویستیش نەبووە لەسەری کە شوێنی بکەوێت بەڵکو پێی ووت: بەڕاستی من لەسەر زانستێکم لەلایەن خواوە، کە خوای گەورە منی لێ فێرکردووە و تۆی لێ فێر نەکردووە. هەروەها تۆیش لەسەر زانستێکیت لەلایەن خواوە کە تۆی، لێ فێر کردووە و من فێری نەبووم.

بەو جۆرە بانگەوازەکەی موسا (عليه السلام) گشتی نەبووە، بەڕاستی پێغەمبەرێك بۆ قەومەکەی خۆی دەنێردرا بە تایبەت، بەڵام (محمد) پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی نێردراوە، بەڵکو بۆ ئینسان و پەرییەکان بە (باطن) و (ظاهر)ەوە نێردراوە، بۆ هیچ کەسێك نییە لە گوێڕایەڵی و شوێن

کەوتنی ئەو دەربچێت، نە لە (باطن) نە لە (ظاهر)دا، نە لە تایبەت و نە لە گشتیدا.[٦٦]

پاش هەموو ئەو بەڵگە و بۆچونانەی کە هێنامان دەرکەوت کە ئەو بەڵگانەی پێغەمبەرێتی (خضر) جێگیر دەکەن بەسن و جێگەی قەناعەتن، بۆ هەر کەس کە ڕاستی و دادپەروەری بوێت. بەڵام ئەوەی کە دەبێتە هۆی بیر و بۆچونی جیاواز لە کارەکەیدا بریتییە لەوەی کە ناوی لە ئایەتە قورئانییەکاندا نەهاتووە تا لەناو ڕیزی پێغەمبەراندا بێت. لە سەرو هەموو ئەمانەیشەوە ئەو کەسانەی کە دەڵێن (ولی) بووە بەڵگەی بەهێزیان نەهێناوە کە نەفی پێغەمبەرایەتییەکەی بکات، بەڵگەکانی ئەوانیش بەپەسەند وەردەگیرێت لەگەڵ ئەوەیشدا بەڵگەکان سەلماندویانە پێغەمبەرە.

## حوکمی باوەڕ بوون بە پێغەمبەرایەتی (خضر) (علیه السلام)

لە سەرو ئەم ڕا و بۆچونە جیاوازانەوە کەس تاوانبار نابێت ئەگەر بڵێت: پێغەمبەر نەبووە، چونکە باوەڕی تەواو و پێویست پێك نایەت تەنها لە ڕێگەی (تواتر)ەوە نەبێت. بەڵام پێویستە باوەڕ بە سەرجەم پێغەمبەران بکرێت بە گشتی کە جێگای تەکلیفن لەو پێغەمبەرە بەرێزانەیش ناوی (٢٥) بیست و پێنجیان لە قورئاندا هاتووە.[٦٧]

---

66 – مجموع فتاوى شيخ الأسلام احمد بن تيمية: ٢٦٦/١٢-٢٦٧

67 – شرح جوهرة التوحيد للباجوري ص٦٧ بەکەمێك دەسکارییەوە.

## ئەوەی دەربارەی زانستی (خضر) (علیه السلام) هاتووە

پێشەوا (النسفي) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(الكهف/٦٥) دەڵێت:[68] ﴿مِن لَّدُنَّا﴾ واتە: لە لایەن خۆمانەوە.[69] لەگەڵ ئەوەی کە هەموو زانستێك لە لایەن خواوەیە، بەڵام هەندێکیان بە هۆی فێرکردنی دروستکراوەکانەوە دەبێت، ئەوە پێی ناوترێت زانستی (لدني)، بەڵکو ئەوە زانستی (إنفعالي)یە، چونکە لە کەسێکی ترەوە وەرگیراوە، بەڵام زانستی (لدني) ئەو زانستەیە کە لە نهێنی دڵدا دەکرێتەوە و وەردەگیرێت، واتە: (باطن) ناوەڕۆکەکەی بە (قلب القلب) ناوبراوە، و بەبێ هیچ هۆکارێکی پێکهاتوو لە دەرەوە، واتە: بەبێ فێربوون و لێکۆڵینەوە.[70]

هەروەها ئەم زانستە بە زانستی (الحقيقة)یش ناودەبرێت هەروەها زانستی (اللدني) و زانستی (المكاشفة) و زانستی (الموهبة) و زانستی (الأسرار) و هەروەها زانستی (المكنون) و زانستی (الوراثة).[71]

ئەو زانستی (لدني)یە، تایبەتە بە خوای گەورە، هیچ کەس بەبێ ویست و تەوفیقی خوای گەورە فێری نابێت.

هەروەها لە هەڵبژاردنی ووشەی ﴿علمناهُ﴾ لە باتی (آتیناهُ)، ئاماژەیە بۆ گەورەیی و گرنگی ئەو زانستە..[72]

---

[68] سە یری تە فسیری (النسفي) و (البيضاوي) أیە (٦٥)ی الكهف بكە.

[69] وشەی (لدن) (ظرف مكان)ە واتە(عند) تەنها لە(حاضر)دا بەکاردێت ،هەروەها ووشەی (اللدني)ڵێ وەردەگیرێت.

[70] – سەیری (إتحاف السادة المتقين بشرح أسرار أحياء علوم الدين)ی (الزبيدي) ٢٦٠/٧بكە.

[71]- سەیری (الطبقات الكبرى للشعراني) ١٧٠/١، ٥٦/٢.بكە ، هەروەها سەیری (تعريفات و تعليقات عديدة على هذا المصطلح) لە (روح البيان في التفسير القرآن) ٤٩٩/٢–٥٠٠ و (روح المعاني)٢٢/١٦ و (التفسير الكبير للفخر الرازي) ١٤٩/٢١–١٥٠، بكە.

[72]- سەیری (روح المعاني) ٣٣٠/١٥ ، بكە بە کورتی و دەستکارییەوە.

گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە بەڕاستی ئەو زانستەی کە (خضر) وەری گرت، زانستێکی (رباني) بوو، و تایبەت بوو بەو، و پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل لێی فێر نەبوو بوون، ئەو گەورەترین زانای سەردەمی خۆی بوو، بەڕاستی چیرۆکی موسا لەگەڵ (خضر)دا (علیه السلام) بوو بە نموونەیەکی گەورە لای زانایان لە ڕونکردنەوەی ئەدەبی زانا و فێرخوازدا زۆر بە نموونە دەهێنرێتەوە...

بەڕاستی کەسێ زانا هەر چەندێك زانستی وەرگرتبێت، پێویستە لەسەری لە خۆی بایی نەبێت، و دەبێت بزانێت لە سەرو هەموو خاوەن زانستێکەوە کەسێکی زاناتر هەیە. بەڕاستی (خضر) زانی کە موسا ئارام ناگرێت لەگەڵیدا، لەبەر ئەوە پێی ووت: (بەڕاستی تۆ ناتوانیت هاوڕێیەتی من بکەیت لەو شتانەدا کە لە مندا دەیبینیت کە پێچەوانەی دەقی شەریعەتەکەی تۆن، چونکە من لەسەر زانستێکم لەلایەن خواوە، کە خوای گەورە تۆی لێ فێرنەکردووە، و تۆیش لەسەر زانستێکیت لەلایەن خواوە، کە خوای گەورە منی لێ فێرنەکردووە، هەر یەکەمان تەکلیف کراوین بە کۆمەڵە کارێك لە لایەن خواوە، بەبێ ئەوی ترمان – هی هەریەکەمان جیاوازە– تۆ ناتوانیت هاوەڵی من بکەیت: ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا﴾(الكهف/٦٨). من دەزانم کە تۆ ئینکاری کارەکانی من دەکەیت، بەڵام تۆ لە حیکمەتەکەی ئاگادار نیت و نازانیت بەرژەوەندییە شاراوەکەی چییە).[٧٣] ئەو زانستەی ئەو ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە بوو، کە بوو بە هۆی ئەنجام دانی ئەو کارانە، ئەوە فەرمانی خوا بوو، نەك فەرمانی خۆی، خوای گەورە (خضر)ی لە هەندێك لە غەیب ئاگادار و شارەزا کرد بوو لەم مەسەلەیەدا و لە پێشتردا و ئاراستەی کرد بۆ ئەو هەڵس و کەوتانە، کە ڕێك بوو لەگەڵ ئەوەی کە لێی ئاگادار بوو: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾.[٧٤]

ڕیوایەت کراوە، کاتێك موسا (علیه السلام) سەلامی کرد لە (خضر) کە ڕاکشا بوو، ناسی کە ئەوە موسایە، ئینجا سەری بەرز کردەوە و ڕاست بوویەوە و ڕێك دانیشت و ووتی: (و علیكَ السلام) ئەی پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل،

---

[73] – تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٩٦/٣ بە دەستكارییەوە.

[74] – في ظلال القرآن٤/٢٢٨٢.

ئینجا موسا ووتی: تۆ چۆن من دەناسیت و هەواڵم دەزانیت و دەزانیت من کێم؟ کێ هەواڵی پێداویت کە من پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیلم؟ ووتی: ئەو کەسەی کە هەواڵی منی پێداویت و ڕێنمایی تۆی کردوە بۆلای من. پاشان وتی: ئەی موسا! ئایا تۆ ئەوەت بەس نییە کە تەوراتت بە دەستەوەیە، و وەحیت بۆ دێت؟ موسا (علیه السلام) وتی: بەڕاستی پەروەردگارم منی نارد بۆ لای تۆ تا شوێنت بکەوم و لە زانستەکەت فێر ببم.[٧٥]

## کامیان زاناترن؟!

ئایا پاش ئەم لێکۆڵینەوەیە دەتوانین بڵێین: بەڕاستی (خضر) لە موسا (علیه السلام) زاناترە؟ هەندێك کەس دەڵێن: بەڕاستی ئەم زانایە -خضر- تایبەتمەند بوو بە بینا کردنی بڕیارە حەقیقەتییەکان لەسەر ئەو شێواز و حاڵەتە (باطن) شاراوەیە. بەڵام موسا (علیه السلام) بەو جۆرە نەبووە، بەڵکو بڕیار و حوکمەکانی ئەو لەسەر (ظاهر) ئاشکرای کارەکان بنیاتنرا بوو، بێگومان جیاوازی لە نێوانیاندا لە بواری زانستدا دەرکەوت....

بەم ڕێگایە دەرکەوت کە پلە و پایەی (خضر) لە زانستدا لە سەرو پلەو پایەی موسا (علیه السلام)ەوە بوو.[٧٦]

لەسەر ئەوەی موسا زانستێکی هەبوو کە لای (خضر) نەبوو، هەروەها لای (خضر) زانستێك هەبوو لای موسا نمونەی نەبوو.

پێشەوایان (بخاري و مسلم و ترمذي و نسائي) فەرمودەیەکی (إبن عباس)یان بە (مرفوع) (تحریج) کردووە، کە (خضر) (علیه السلام) فەرموی:

---

75 - (روح المعاني) ٣٢٠/١٥

76 - التفسير الكبير للرازي ١٥٩/٢١

ئەی موسا! بەڕاستی من لەسەر زانستێکم لە زانستی خوای گەورە کە فێری کردووم و تۆ نایزانیت، تۆیش لەسەر زانستێکیت لە زانستی خوای گەورە کە فێری کردویت، من نایزانم. تۆ دەزانیت ئەگەر فەرمودەکەی خوای گەورە نەبوایە بۆ موسا، کە لە پێشتر باسکرا! بەڕاستی من بەندەیەکم هەیە لە شوێنی بە یەکگەیشتنی دوو دەریاکە، ئەو لە تۆ زاناترە لە هەندێك لە زانستەکاندا، بەڵکو لەسەر ئەو مانایەی لە هەموو زانستەکاندا زاناترە، ئیتر ئاڵۆزی بۆ دروست بوو لە نێوان کۆبوونەوەی خۆی و ئەوەی کە باسمان کرد لە ووتەکانی (خضر) (علیه السلام).[٧٧]

......لەمەوە باسکرا دەزانرێت کە بەڕاستی موسا (علیه السلام) (أکمل) تەواوتر بووە لە (خضر) و (زاناتر)ی (خضر) یش، بە زانستی (حقیقة) بە نیسبەتێك بووە تا کاتی ئامادەیی خۆی، بەڕاستی موسا (علیه السلام) ئەمەی تێپەڕاند و لایدا ڕانەوەستا، چونکە ئەو لە مەقامی (تشریع)دا بوو، ڕەنگە داواکردنی بۆ زانست بە فەرمانێك بوو بێت لەوەوە دەستی پێ کردبێت، بە هۆی ئەو لەخۆ ڕابینینەوە.[٧٨]

پێشەوا (القرطبي) وتەیەکی (إبن عطیة)ی هێناوە: زانستی (خضر) زانستی زانینی (بواطن) ناوەڕۆك و شاراوەکان بووە، بە شێوەیەك بۆی وەحی کرابوو، ئەو (ظاهر)ی بڕیارەکانی پێ نەدرابوو. بەڵام زانستی موسا، زانستی بڕیارەکان بوو، و فتوای لەسەر قسەی خەڵکی و کارەکانیان دەدا.[٧٩] هەروەها لە (أسرار القرآن)دا ...ووە.... بەڕاستی (خضر) لە مووسا زاناتر بووە، لەوەدا کە لە موسا (علیه السلام) ڕویدا.[٨٠]

---

77 – روح المعاني ٣٣٢/١٥.

78 – روح المعاني ٢٠/١٦ بەدەستکارییەوە.

79 – تفسیر القرطبی ١٦/١١ بە دەستکارییەوە.

80 – روح المعاني ٢٢/١٦.

# بەشی چوارەم

## باسی یەکەم: چیرۆکی موسا و (خضر) (علیهما السلام)

### ئینسان و ژیان:

چیرۆکی موسا و (خضر) (علیهما السلام)... بەڕاستی چیرۆکی ئەم ژیان و بوونەوەرەن، کە ئێمە تێیدا دەژین، چیرۆکێکە کە شێوازی کرداری تیادا جێگیر و چەسپاو دەبێت، ڕوون و جوان و ناوازەیە، بەڕاستی لە پشت شتە زانراو و دۆزراوەکانەوە لەم جیهانەدا و لەم ژیانەدا، شتێکی زۆر و نەزانراو هەن، بەڕاستی ئەوەی کە ئینسان نایزانێت - با گەورەترین ئینسانی سەردەمەکەی خۆیشی بێت -زۆرترە لەوەی کە دەیزانێت، و بەڕاستی ئەو هەمیشە بڕیارەکانی لەسەر ئەوە بینا دەکات کە دەیبینێت و هەستی پێ دەکات، لەبەر ئەوە هەڵەی زۆر دەکات، و زۆر شتی لێ تێك دەچێت، بەڕاستی ئەگەر ئەو ڕاستییەکانی ژیان و ناوەڕۆك و نهێنی کارەکانی بۆ دەربکەوێت و بزانێت داهاتوویان چییە، ئەوا بڕیارەکانی زۆر دەگۆڕێت، و ئەوەی بۆ جێگیر دەبێت کە دڵنیا نەبووە لە بڕیارەکانی و حەزەکانی وەك پێویست دەرنەچوون، ڕاست نابێت بە پەلە بڕیار بدرێت و زۆر بکرێت لەسەر بیر و بۆچوونەکان، چونکە بەڕاستی ژیان تەم و مژاوی و ئاڵۆزە، بوونەوەریش فراوان و بەرینە، زۆر شتیش هەیە کە نهێنییەکەی لە ئاشکراکەی جیاوازە، بەڕاستی لەم ژیانەدا زۆر شت هەن پێچ و پەنایان هەیە، ئینسان نەیتوانیوە -لەسەر ئاستی زیرەکی و سور بوونی خۆیەوە- چارەسەریان بکات. بەڕاستی لە بوونەوەردا ئاڵۆزی و پێچ و پەنا و نهێنی هەیە، زانستی بەشەر -لەگەڵ ئەوەی زۆر فراوان بووە و پێش کەوتووە و

گەشەی سەندووە–نەیتوانیوە بیاندۆزێتەوە، بەڕاستی ژیانی ڕۆژانەی گشتیمان پڕە لە هەڵە و سەرپێچی و بڕیاردانی بەپەلە و هەنگاوی نادروست و شپرزە و بیر و ڕای سەرپێیانە، ئەگەر بەڕێوەبردنی ئەم جیهانە فراوانەی بدرێتە پاڵ و ئازادی تەواوی پێ بدرێت و هەلس و کەوتی ڕەها ئەنجام بدات، ئەوا خراپترین و گەندەڵترین جیهان بەرهەم دێت و دەردەچێت، و کێڵگە و نەوە و وەچەکانی و بەرهەمەکانیان دەفەوتێت، چونکە تێڕوانینی کورتە و کەم دەبینێت، و کارەکانی سنوردارە، و بەڕاستی لە پەلەکاری دروستکراوە و لەسەر پەلەکردن و کورت بینی ڕاهاتووە.[٨١]

## هۆکاری داواکەی موسا بۆ گەیشتن بە (خضر)

جارێکیان بەڕاستی موسا (علیە السلام) لەناو نەوەی ئیسرائیلدا وتاری بۆ دان، پرسیاری لێکرا: چ کەسێك زاناترین کەسە؟ ئەویش فەرمووی: من، پاشان خوای گەورە گلەیی لێکرد کاتێك زانستەکەی نەگێڕایەوە بۆ لای خوای گەورە، پاشان خوای گەورە وەحی بۆ نارد: بەڕاستی من بەندەیەکم هەیە لە شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو دەریاکە کە ئەو لەتۆ زاناترە.[٨٢]

### شوێن و سەردەمی چیرۆکەکە:

ئەمە بەشێکە لە ژیاننامە و بەسەرهاتی موسا (علیە السلام) لە قورئانی پیرۆزدا تەنها یەك جار باسکراوە و لە سورەتی (الکهف)دا!

---

[81] – لە کتێبی (الصراع بین الأیمان والمادیة) ی (أبي الحسن الندوي) ص/ ٩٣–٩٤) بە کەمێك دەستکارییەوە وەرگیراوە.

[82] - رواە الشیخان عن إبن عباس عن أبي بن کعب.

وای لێك دەدەینەوە هۆکاریك هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوەیەی ژیانی موسا لەگەڵ (خضر)دا بەسەری بردووە لەبەر هۆکارێکی کوت و پڕ بووە....کە موسا تیایدا وانەیەکی (رباني) وەرگرت و ئەوەی بەس بوو! بەوە کۆتایی بە کارەکەی هات کە بە شێوەیەکی ڕوون و دیار دانی نا بە ڕاستییەکاندا.

وەك ئەوەی ئەم ڕوداوە غەریبە بە لایەنێکی (شخصي) کەسایەتی لە ژیانی بانگەوازی ڕاستەقینەدا بژمێردرێت کە پێغەمبەران (علیهم السلام) لە پێناویدا نێردراون...

وەك ئەوەی شتێکی (شخصي) بێت پێویست بە دووبارە کردنەوە نەکات.... با سود و گرنگیەکەیشی دیار و ئاشکرا بێت، و پەند و وانەیش دیار و ئاشکرایە بۆ کەسێك کە بیەوێت پەند و وانە وەربگرێت.

قورئان ئەو شوێنە دیاری ناکات کە چیرۆکەکە تیایدا ڕویداوە تەنها بە (مجمع البحرين) شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو دەریاکە نەبێت.

هەروەها ئەو کات و سەردەمەیشی لە ژیانی موسا دیاری نەکردووە کە تیایدا ڕویداوە ئایا دەبێت ئەو کاتە بوو بێت کە لە میسردا بووە پێش ئەوەی بە نەوەی ئیسرائیلەوە دەربچێت، یان دوای دەرچونی بووە بەوانەوە لە میسر؟ خۆ ئەگەر دوای دەرچون بێت، ئایا دەبێت پێش ئەوە بوو بێت کە ئەوان بگەیەنێتە خاکی (المقدس) یان دوای ئەوە بووە کە ئەوان بگەیەنێت، ئینجا لەو کاتەدا ڕاوەستاون و نەدەچونە ناوەوە، چونکە قەومێکی زۆردار و ستەمکاری تێدا بووە؟ یان دوای ئەوە بووە بیانبات بۆ (التيه) کاتی وێڵ و سەرگەردانیان لەسەر زەویدا کە لەیەك جیادەبونەوە و دوور دەکەوتنەوە؟[83]

---

83 – في ظلال القرآن ٥/٣٥٩ طه بەکەمێك دەسکارییەوە.

پێشەوا (المودودي) (خوا لێی ڕازی بێت) وای دەبینێت کە ئەم دیمەنانەی پیشانی موسا (علیه السلام) دران لە سەرەتای پەیمانی پێغەمبەرایەتییەوە بووە، چونکە ئەم بەشە لە (فێرکردن و پەروەردەکردن) بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام) لە سەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە دەبێت.

بەڕاستی بینینی ئەم دیمەنانە بۆ موسا پێغەمبەر (علیه السلام) پێویست بوو، کاتێك نەوەی ئیسرائیل ڕوو بەڕووی ئەو حاڵەتانە دەبونەوە، کە موسوڵمانە پێشینەکان لە شاری مەککەی پیرۆزدا ڕوو بەڕووی دەبوونەوە.

لەسەر بوونی ئەم دوو هۆکارە –زانستی تەواویش لای خوایە– بەڕاستی ئەم ڕووداوە لە ژیانی موسادا کاتێك ڕوویداوە، کە نەوەی ئیسرائیل بەدەست خراپترین سزاوە دەیان ناڵاند هەروەها جۆرەها ستەم و چەوسانەوەی فیرعەونیان بەسەردا دەباری لە میسردا.

پاشان دەڵێت: ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە بۆی چوین، ئەوا دەگونجێت کە گەشتی موسا لەو کاتەدا بەرەو سودان بوو بێت، و مەبەستیش بە (مجمع البحرین)، شوێنی بە یەکگەیشتنی دەریای (الأزرق) و دەریای (الأبیض) بێت –هەردوو لقەکەی ڕوباری نیل– لە نزیك شاری (خرطوم). ئەوەیش چونکە ئەو شوێنەی کە موسا (علیه السلام) هەموو ژیانی خۆیی تیا بەسەر بردووە، شوێنێکی تر دەست ناکەوێت بەو ناوە، تەنها ئەو شوێنە نەبێت.[٨٤]

---

[84] – تەفسیری هەردوو سورەتی (الکهف و مریم)ی (ابي الأعلی المودودي) ل٤٨–٤٩، سەیری تەفسیری (مجمع البحرین) ل٧٢–٧٣ بکە.

## باسی دووەم

## تەفسیر و شیکردنەوەی ئایەتەکان

### چیرۆکی موسا و (خضر) بەندە چاکەکارەکە

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ
أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا (60) فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا
(61) فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا (62) قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ
أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي
الْبَحْرِ عَجَبًا (63) قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا (64) فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ
عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا (65) قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن
تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا (66) قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (67) وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا
لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا (68) قَالَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا (69) قَالَ فَإِنِ
اتَّبَعْتَنِي فَلا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا (70) فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي
السَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا (71) قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن
تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا (72) قَالَ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا (73)
فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا
(74) قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا (75) قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا
فَلا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا (76) فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا
فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ
أَجْرًا (77) قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا (78) أَمَّا
السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ
سَفِينَةٍ غَصْبًا (79) وَأَمَّا الْغُلامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا (80)
فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا (81) وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلامَيْنِ

يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾(الكهف: ٦٠ – ٨٢).

**چیرۆكی مووسا (علیه‌السلام) و (خضر) بەندە چاكەكارەكە بە درێژی لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ باسی هاتووە، یەكێك لەو فەرموودانەی باسی دەكەین، ئەمە دەقەكەیەتی: {عن سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفًا الْبِكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ لَيْسَ هُوَ مُوسَى صَاحِبَ بَنِي إِسْرَائِيلَ،•فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ مُوسَى قَامَ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا، فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: إِنَّ لِي عَبْدًا بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، قَالَ مُوسَى: يَا رَبِّ فَكَيْفَ لِي بِهِ قَالَ تَأْخُذُ مَعَكَ حُوتًا فَتَجْعَلُهُ فِي مِكْتَلٍ فَحَيْثُمَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَهُوَ ثَمَّ فَأَخَذَ حُوتًا فَجَعَلَهُ فِي مِكْتَلٍ ثُمَّ انْطَلَقَ وَانْطَلَقَ مَعَهُ بِفَتَاهُ يُوشَعَ بْنِ نُونٍ حَتَّى إِذَا أَتَيَا الصَّخْرَةَ وَضَعَا رُءوسَهُمَا فَنَامَا وَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِي الْمِكْتَلِ فَخَرَجَ مِنْهُ فَسَقَطَ فِي الْبَحْرِ {فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا} وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَنْ الْحُوتِ جِرْيَةَ الْمَاءِ فَصَارَ عَلَيْهِ مِثْلَ الطَّاقِ و في رواية: وَفِي أَصْلِ الصَّخْرَةِ عَيْنٌ يُقَالُ لَهَا الْحَيَاةُ لَا يُصِيبُ مِنْ مَائِهَا شَيْءٌ إِلَّا حَيِيَ فَأَصَابَ الْحُوتَ مِنْ مَاءِ تِلْكَ الْعَيْنِ قَالَ فَتَحَرَّكَ وَانْسَلَّ مِنْ الْمِكْتَلِ فَدَخَلَ الْبَحْرَ فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ نَسِيَ صَاحِبُهُ أَنْ يُخْبِرَهُ بِالْحُوتِ فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَلَيْلَتَهُمَا حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ الْغَدِ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ: {آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا} قَالَ: وَلَمْ يَجِدْ مُوسَى النَّصَبَ حَتَّى جَاوَزَا الْمَكَانَ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ بِهِ فَقَالَ لَهُ فَتَاهُ: {أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهِ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا} قَالَ: فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا وَلِمُوسَى وَلِفَتَاهُ عَجَبًا، فَقَالَ مُوسَى: {ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا} قَالَ: رَجَعَا يَقُصَّانِ آثَارَهُمَا حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى ثَوْبًا فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى فَقَالَ الْخَضِرُ وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ، قَالَ: أَنَا مُوسَى، قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ أَتَيْتُكَ لِتُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رَشَدًا، قَالَ: {إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا} يَا مُوسَى إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَنِيهِ لَا تَعْلَمُهُ أَنْتَ وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَكَهُ**

اللَّهُ لَا أَعْلَمُهُ، فَقَالَ مُوسَى {سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا} فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ {فَإِنْ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا} فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَمَرَّتْ سَفِينَةٌ فَكَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمْ فَعَرَفُوا الْخَضِرَ فَحَمَلُوهُمْ بِغَيْرِ نَوْلٍ فَلَمَّا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ لَمْ يَفْجَأْ إِلَّا وَالْخَضِرُ قَدْ قَلَعَ لَوْحًا مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ بِالْقَدُومِ فَقَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ قَدْ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا {لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا} قَالَ وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَتْ الْأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا قَالَ وَجَاءَ عُصْفُورٌ فَوَقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ فَنَقَرَ فِي الْبَحْرِ نَقْرَةً فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ مَا عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ إِلَّا مِثْلُ مَا نَقَصَ هَذَا الْعُصْفُورُ مِنْ هَذَا الْبَحْرِ ثُمَّ خَرَجَا مِنْ السَّفِينَةِ فَبَيْنَا هُمَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ إِذْ أَبْصَرَ الْخَضِرُ غُلَامًا يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فَأَخَذَ الْخَضِرُ رَأْسَهُ بِيَدِهِ فَاقْتَلَعَهُ بِيَدِهِ فَقَتَلَهُ فَقَالَ لَهُ مُوسَى {أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا} قَالَ وَهَذِهِ أَشَدُّ مِنْ الْأُولَى {قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْرًا فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ} قَالَ مَائِلٌ فَقَامَ الْخَضِرُ فَأَقَامَهُ بِيَدِهِ فَقَالَ مُوسَى قَوْمٌ أَتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُطْعِمُونَا وَلَمْ يُضَيِّفُونَا {لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ إِلَى قَوْلِهِ ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا} فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَدِدْنَا أَنَّ مُوسَى كَانَ صَبَرَ حَتَّى يَقُصَّ اللَّهُ عَلَيْنَا مِنْ خَبَرِهِمَا قَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا وَكَانَ يَقْرَأُ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا وَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ}[85]

واتە: (سعید)ی کوڕی (جبیر) دەڵێت: ووتم بە (إبن عباس) (علیهما السلام)، (نوف البكالي) وا گومان دەبات کە مووسای بەنی ئیسرائیل، لە مووسای هاوڕێی (خضر) جیاوازە، (ابن عباس) وتی: ئەو دوژمنی خوایە و درۆ دەکات، لە (أُبي) کوڕی (کعب)م بیستووە: دەیووت: بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ دەیوت: مووسا (علیه السلام) هەستا لەناو (بني إسرائیل)دا،

[85] – (بخاري) لە (الأنبیاء)دا بە ژمارە (٣٢١٩) و (مسلم) لە (الفضائل)دا ڕیوایەتیان کردوە.

ووتاری خوێندەوە، پرسیاری لێکرا: کێ زاناترین کەسە لە ئادەمیزاد؟

فەرمووی: من زاناترین کەسم، خوای گەورە سەرزەنشتی کرد لەبەر ئەوەی زانستەکەی نەگێڕایەوە بۆ خوا، ئینجا خوا (وەحی) بۆ نارد کە بەندەیەك لە بەندەکانی من وا لە (مجمع البحرين) شوێنی بە یەککەیشتنی دوو دەریاکە، لە تۆ زاناترە، مووسا (علیه السلام) فەرمووی: ئەی خوایە چۆن پێی دەگەم؟ پێی فەرموو: ماسییەك لە زەمیلەیەکدا هەڵبگرە و برۆ، لە هەر لایەکدا ماسییەکەت لێ وونبوو، ئەوا لەوێدایە، مووسا و هاوڕێکەی کە (یوشع)ی کوڕی (نون) بوو، کەوتنە ڕێ، مووسا ماسییەکی لەناو زەمیلەدا هەڵگرت، خۆی و هاوڕێکەی ڕۆیشتن، تا گەیشتنە لای بەردێکی گەورە، مووسا و هاوڕێکەی خەویان لێ کەوت، ماسییەکەیش لەناو زەمیلەکەدا کەوتە جووڵەجووڵ و دەرچوو، خۆی خستە ناو دەریاکەوە، خوایش ئاوە ڕەوانەکەی وەستاند، هەتا وەك تاقێکی سەرگیراوی لێ هات! لە گێڕانەوەیەکدا: لە بن ئەو بەردە گەورەیەدا، کانیاوێك هەیە، ناوی: کانیی ژیانە، و بەناوبانگە بە ئاوی حەیات، هەرچی شتێك لەو ئاوەی لێ بکەوێت زیندوو دوبێتەوە، جا ماسییەکە لە ئاوی ئەو کانییەی لێ دەکەوێت و دەجووڵێتەوە و ڕادەچەنێت و لە زەمیلەکە دەردەپەڕێت و دەچێتە ناو دەریاکەوە، بوو بە ڕێگا بۆ ماسییەکە و بوو بە جێگای سەرسوڕمانیش بۆ مووسا و هاوڕێیەکەی، ئەو ڕۆژ و شەوە ڕێگایان کرد، هاوڕێیەکەی مووسا بیری چوو هەواڵی ماسییەکە بە مووسا بدات، کاتێك ڕۆژ بوویەوە مووسا بە هاوڕێیەکەی وت: (خواردنەکەی بەیانیمان بۆ بهێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا ماندووین).

دەفەرموێت: ماندوویش نەبوو هەتا لەو شوێنە تێپەڕی کە فەرمانی پێ کرابوو، هاوڕێیەکەی پێی وت: (لەبیرتە لەو کاتەدا، کە لە پەنای بەردە گەورەکەدا لاماندا، لە یادم چوو باسی ماسییەکەت بۆ بکەم، شەیتان لە بیری بردمەوە، کە چۆن بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێگای خۆی بۆ ناو دەریاکە گرتە بەر) مووسا (علیه السلام) فەرمووی: (ئەوە، ئەو مەبەستەیە کە ئێمە

دەمانەوێت، بۆیە هەر بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە).

شوێن پێی خۆیانیان هەڵدەگرت، هەتا گەیشتنە لای بەردەکە، پیاوێکی بینی خەوتبوو، بە پارچە جلێك خۆی داپۆشیبوو، مووسا (علیه السلام) سەلامی لێکرد، (خضر) پێی ووت: کەی لەم زەوییەی تۆدا سەلام هەیە؟ ووتی: من مووسام، ووتی: مووسای نەوەی ئیسرائیل. ووتی: بەڵێ، ووتی: بەڕاستی تۆ زانستێکت لا هەیە خوا فێری کردوویت من نایزانم؟ منیش زانستێکم لا هەیە، خوا فێری کردووم، تۆ نایزانیت، مووسا (علیه السلام) پێی ووت: ئایا لەگەڵتا بێم، بۆ ئەوەی هەندێك لەو ڕێنمایییانەی کە فێر کراویت، فێری منیشی بکەیت؟

ووتی: بەڕاستی تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت و ئارامگر بیت، ئایا چۆن دەتوانیت خۆت بگریت لەسەر شتێك کە پەی بە ئاکامی و ئەنجامی نابەیت؟ وتی: دەمبینیت –إن شاءالله– خۆگر دەبم، و لە فەرمانی تۆ دەرناچم، بەندەکە پێی وت: (ئەگەر دوای من کەوتیت، پرسیاری هیچ شتێکم لێ مەکە، هەتا دواتر بۆت باسدەکەم) وتی: بەڵێ، بەندەکە و مووسا ڕۆیشتن بە کەناری دەریاکەدا، کەشتییەك بە لایاندا تێپەڕی، قسەیان لەگەڵدا کردن هەڵیانگرن، (خضر)یان ناسی، بە بێ کرێ هەڵیانگرتن، کەچی (خضر) پەلاماریدا، تەختەیەکی ئەو کەشتییەی هەڵکێشا، مووسا (علیه السلام) پێی ووت: کۆمەڵێك ئێمەیان بە بێ کرێ هەڵگرت، کەچی تۆ پەلاماری کەشتییەکەیانتدا و کونت کرد)، بۆ ئەوەی سەرنشینەکانی لە ئاودا بخنکێن! بەڕاستی شتێکی زۆر گەورە و ناڕەوات کرد! وتی: من نەموت، تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت، وتی: ئەم لەبیرچونەم لێ مەگرە و لەم کارەمدا تەنگە تاوم مەکە). پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم جاری یەکەمەیان مووسا لە یادی نەبوو، فەرمووی: (لەو کاتەدا چۆلەکەیەك هاتە سەر لێواری کەشتییەکە و دەنووکی دا لە دەریاکە، (خضر) بە مووسای فەرمو: زانستی من و تۆ لە زانستی خوای کەم نەکردۆتەوە مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی ئەو چۆلەکە لە دەریاکەی کەم کردەوە).

دوای ئەوە لە کەشتییەکە دەرچوون و بە کەناری دەریاکەدا دەڕۆیشتن، توشی منداڵێك هاتن لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، (خضر) گرتی و کوشتی، مووسا (علیه السلام) پێی ووت: (ئایا منداڵێکی بێ تاوانت کوشت، بێ ئەوەی ئەو هیچ کەسێکی کوشتبێت، بەڕاستی کارێکی زۆر ناشیرینت کرد، ووتی: من پێم نەووتیت: تۆ ناتوانیت لەگەڵ من خۆت بگریت؟) ئەم جارەیان لە جاری ڕابردوو توندتر بوو، مووسا (علیه السلام) فەرمووی: (ئەگەر جارێکی تر من پرسیارم لێ کردیت، ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە). چونکە لەگەڵ من گەیشتیتە ئەو ئاستەی گلەییت لێ ناکرێت. ڕۆیشتن... تا گەیشتنە گوندێك و داوای خواردنیان کرد، توشی دیوارێك هاتن، خوار بووبویەوە، ڕاستی کردەوە). دەڵێت: کەمێك خوار بوو، (خضر) دەستی دایە ژێری و ڕاستی کردەوە، مووسا (علیه السلام) پێی ووت: هاتینە ناو گوندێك بە میوانی وەریان نەگرتین، نانیان نەدایني، (گەر بتویستایە کرێیەکت وەردەگرت لەسەر ئەم دیوار ڕاستکردنەوەیەت). (خضر) فەرمووی: ئەمە جیابوونەوەی نێوان من و تۆیە، ئێستا ئاگاداریشت دەکەم لەسەر ئەو شتانەی توانات نەبوو خۆتی لەسەر بگریت و ئارامگر بیت). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوا ڕەحم بە مووسا بکات، پێم خۆش بوو خۆی بگرتایە، هەتا هەواڵی زیاتری بۆ ئێمە باسبکرایە). (سعید ی کوڕی جبیر) وتی: (ابن عباس) ئەم ئایەتەی بەم شێوە خوێندنەوەیە دەخوێند: ﴿و کانَ اَمامَهُم مَلِكٌ يَاخُذُ كُلَّ سَفينَةٍ صالحة غَصْبَاً﴾ و ئەم ئایەتەیشی بەم شێوەیە دەخوێند: ﴿و اَما الغلام فكان كافراً و كان اَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ﴾.

# پێش دەستپێکی چیرۆکەکە

گومانی تێدا نییە کە ئەم چیرۆکە پێژەیەکی زۆر گەورە لە پەند و وانە و سود و ئامۆژگاری گرنگی تیایە. سەرەتاکەی وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە، گلەیی خوا بوو لە موسا (علیه السلام) کاتێك زانستی پاڵ دایە پاڵ نەفسی خۆی، و نەیگێڕایەوە بۆ لای خوای گەورە، پاشان لێبوردنی تیایە، ئینجا ڕۆیشت کە زانست فێر بێت، پاشان بەو ئەدەبەی کە لەگەڵ (خضر)دا هەیبوو، کە دەرخستنی ئەدەبی قوتابی بوو بۆ مامۆستاکەی کە ووتی: ﴿هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا﴾.

واتە: (ئایا شوێنت بکەوم تا لەو زانست و زانیارییەی پێت بەخشراوە منیش بەهرەدار بکەیت؟) و چۆن (خضر) زانی کە موسا ئارامگر نابێت و خۆی ناگرێت و ئینکاری دەکات لەو کارانەدا کە بە ڕواڵەت خراپن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا حیکمەت و مەبەستی شاراوەی تیایە، کە تەنها خوا دەیزانێت، و موسایش زۆر حەزی بە حەق بووە بە جۆرێك خۆی نەگرت و بۆ ماوەیەکی درێژ هاوڕێیەتی (خضر) بکات، ئەویش هەواڵی پێدا: کە تۆ ناتوانیت لەگەڵ ئارامگر بیت، و لە چیرۆکەکەدا ئەدەبی فێربوونی زانست بەدی دەکرێت، و ڕێزی زانا و فێر خوازی تیایە و ئەدەبی کەسی زانا لەگەڵ [illegible] کاریدا.

لەم ئەدەبانە نابێت شەڕ نیسبەت بدرێتە پاڵ خوا، وەك ئەدەبێك بەرامبەر خوا، لەگەڵ ئەوەی خوا بەدیهێنەری خەیر و شەڕە، بەڵام شەڕ پاڵ نادرێتە پاڵ خوا، بەڵکو لە هەموو ئەو شتانەی کە خوا تەقدیری دەکات و دەیهێنێت حیکمەت و مەبەستی شاراوەی تیایە لای بەشەر، ئەم ئەدەبەیش لە ئایەتی:

﴿فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا﴾دا دەردەکەوێت، کە کاری خراپکردنی کەشتییەکەی پاڵ دایە پاڵ خۆی.

**لەئایەتی:** ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾.

واتە: (جا پەروەردگارت ویستی کاتێك گەنجینەکەیان دەست بکەوێت کە گەورە و بە هێز بن، ئەوسا دەری بهێنین).

## شیکردنەوەی ئایەتەکانی چیرۆکەکە

ئینجا دێینە سەر ڕونکردنەوەی چیرۆکەکە لە ڕوانگەی ئایەتە قورئانییەکانەوە.

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾(الكهف: ٦٠).

واتە: ئەی محمد ﷺ باسی چیرۆکی موسا یادی خەڵکی بێنە، کاتێك بە هاوەڵی لاوی خۆی وت: من کۆڵنادەم و دەڕۆم، ئەگەر چەندەها ڕۆژم پێ بچێت، تا دەگەمە ئەو شوێنەی کە دوو دەریاکە بەیەك دەگەن، یان دەگەمە ئەنجام، یاخود ماوەیەکی زۆر دەڕۆم و دەگەڕێم (خوای گەورە ویستی موسا پێغەمبەر (علیه السلام) تێ بگەیەنێت، کە بەندەی وای هەیە، لە بواری تردا شارەزان، لەبەر ئەوە ڕێنمونی کردوە، تا بگەڕێت بە شوێن ئەو جۆرە کەسانەدا، و لەوانیش سود وەربگرێت).

(الدکتور محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: پێش ئەوەی بچینە سەر ناوەڕۆك و درێژەی چیرۆکەکە پێویستە چەند ڕاستییەك بزانین کە پێویستە لێی تێبگەین:

بێگومان کاتێك خوای گەورە ئەمانەتە قورس و گەورەکەی دا بەسەر شانی ئینساندا هەڵی بگرێت، ئەویش قبوڵی کرد، واتە ئەوەی پێ سپێردرا بریتی بوو لە کاری خواناسی و شانی دایە بەر کە لەسەر فەرمانەکانی ئەو بڕوات و لێی نزیك ببیتەوە، بۆ ئەوەی لە دنیا و قیامەتدا بەختەوەر ببێت، و کاتێك ئینسان هەڵگرتنی ئەمانەتەکەی قبوڵ کرد، خوای گەورەیش ئیرادەی ئازادی و عەقڵ و بیرکردنەوەی پێ بەخشی، و لە هەموو شوێنەکانی بوونەوەردا ئایەت و بەڵگە و نیشانەی بۆ دانا و کیتابی بۆ دابەزاند، واتە شەریعەتی بۆ نارد، شەریعەتیش لە کۆمەڵێك یاسا و (الضوابط) پێك دێت لە نێوان بەندە و پەروەردگاریدا و لە نێوان بەندە و بەندەدا، ئەم شەریعەت و یاسایانەیش بە دوای پێغەمبەران و نێردراوانی خوادا هاتوون.

گەورومان مووسا (علیه السلام) زانا و شارەزا بووە بە شەریعەت و حەڵاڵ و حەرامی ناسیوە و زانیویەتی چی ڕێگەپێدراوە و چی ڕێگەی پێ نەدراوە، و چی دەگونجێت بکرێت و چی نەکرێت، و فەرمان و نەهی و حەق و ناحەق و خەیر و شەڕی ناسیوە.

پێویستە کار و کردەوە و ڕەفتاری بەندەکان بە پێی شەریعەت ڕێك بکرێتەوە، گەورەمان موسا (علیه السلام) پێغەمبەرێکی گەورە و ڕێزدار بووە و یەکێك بووە لە (أولي العزم)، ئەو زاناترین کەسی سەردەمی خۆی بووە لە شەریعەتدا، و خوای گەورەیش بە ویستی خۆی مامەڵە لە بوونەوەردا دەکات، بە جۆرێکیش مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات کە هەر خۆی لە حیکمەتەکەی تێ دەگات، واتە: بەس خوای گەورە نهێنی قەزا و قەدەر دەزانێت. نهێنی کار وکردەوەکانی خوا و حیکمەتی کارەکانی؛ زانستێکی سەربەخۆیە و تایبەتە بە زاتی خۆی. خوای گەورە لە لایەن خۆیەوە زانستێکی تایبەتی بە (خضر) بەخشی بوو، بەڕاستی ئەم چیرۆکە

چیرۆکێکی ناوازە و گەورەیە و بەیەك گەیشتنێکی گەورەیشە لە نێوان دوو لایەندا: لایەنێکیان شارەزا لە شەریعەتدا و لایەنێکیش شارەزا لە حەقیقەتدا.

شەریعەت و حەقیقەتیش دوو شتی بەیەك گەیشتوون، لەم بەیەك گەیشتنە گرنگەوە کۆمەڵێك ڕاستی گرنگ ڕوون دەبێتەوە کە هەموو لەوپەڕی پێویستیداین پێیان. لە بەیەك گەیشتنی هەردوو لایەنی شەریعەت بە حەقیقەت؛ هەندێك نهێنی لە بواری قەزا و قەدەردا ڕوون دەبێتەوە، لەوانە لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە تێدەگەین: ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾(البقرة:٢١٦).

واتە: (لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن).

وەك ئەوەی کورتەی چیرۆکەکە بریتی بێت لەم ئایەتە کە ماناکرا. پێویستە کار و کردەوەی بەندەکان بە شەریعەت ڕێك بخرێت، بەڵام کارەکانی خوای گەورە بە حەقیقەت ڕاڤە و تەفسیر دەکرێت.

پێویستە کار و کردەوەی بەندەکان بە پێی حەڵاڵ و ڕێگە پێدراو و (مندوب) و فەرمان بێت و پێویستە لە (مکروە) و حەرام دوور بکەوێتەوە، شەریعەتێکی وورد و جوان هەیە، و حوکم و بریاری هەموو شتێکی تێدایە و هەموو جوڵە و ڕاوەستان و مامەڵەیەکی تیا ڕوون کراوەتەوە، و هەموو پەیوەندییەکان ڕێك دەخات، بەڵام کارەکانی خوای گەورە بە پێی زانست و مامەڵە کردنی خۆیەتی. و نهێنی قەزا و قەدەریش هەر خۆی دەیزانێت، زانستی حەقیقەتیش بەشێك لەو شتانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

لە بەیەك گەیشتنی موسا (علیه السلام) و (خضر)دا، زۆر ڕاستی لە زانستی حەقیقەت دەردەکەوێت.

ئەو بەندە چاکەکارە بە شێوەیەکی ڕەها لە موسا (عليه السلام) زاناتر نەبووە، بەڵکو لە زانستی حەقیقەتدا لەو زیرەکتر بوو، موسایش لە زانستی شەریعەتدا لەو زیرەکتر بوو، دەگونجا موسا (عليه السلام) بیوتایە: من لەم زانستەدا زیرەکم کە پەروەردگارم فێری کردوم، لە هەندێك فەرموودەدا هاتووە کە خوای گەورە ویستی موسا فێربکات، و فێری بکات کە لەسەر زەویدا بەندەیەکی چاکەکار هەیە، کە خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە میهرەبانی و ڕەحمەتی پێ بەخشیوە و فێری زانستێکی کردووە کە تیایدا لە موسا (عليه السلام) زاناترە.

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەیش تەنها ئەوەی لەسەر بووە کە داوا لە خوای گەورە بکات، ئەی پەروەردگارا؛ چۆن من پێی بگەم و لێیەوە فێر ببم؟

﴿أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا﴾(الكهف:٦٠). موسا (عليه السلام) فەرمووی: خۆ ئەگەر نەگەیشتمە شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکە، ئەوا بۆ ماوەی دوور و درێژ هەر دەڕۆم، ساڵ لەسەر ساڵ لە ڕۆیشتندا دەیخەمە سەر یەك، هەتا دەگەم بەو بەندە چاکەکارە.

جوان تەماشا بکەن و بزانن، کە ئەم زانستە لە تێڕوانینی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەدا چەند بەنرخ و بەها بووە، هەریەك لە ئێمەیش خۆمان لە کۆڕی زانست بە دوور دەگرین لەبەر هۆکاری زۆر بچوك و بێ نرخ: دەڵێن: بۆنەیەکمان هەیە، یان میوانمان دێت......هتد.

لە کاتێکدا کە مەجلیسی زانست ئەو هەموو نرخ و بەها بەپێز و گرنگەی هەیە.

ئەو (موسا)یەی لە ئایەتەکەدا هاتووە، بەپێی بۆچوونی زۆرینەی زانایانی تەفسیر، (موسای کوڕی عمران)ە، کە یەکێکە لە پێغەمبەرانی (أولوا العزم)، وەك لە پێشتر لە فەرمودەکەدا باسەکەی بە درێژی هات.

کوڕە گەنجە لاوەکەیش (یوشعی کوڕی نون)ە، بە (فتی) ناو براوە، چونکە لەگەڵ موسادا بووە و زانستی لێ وەردەگرت و خزمەتی دەکرد.

زانا (قتادة) دەڵێت: دوو دەریاکە: دەریای (فارس)و دەریای (الروم)ن، دەریای (فارس) ڕوەو ڕۆژهەڵاتە و دەریای (الروم) ڕوەو خۆرئاوا. بۆچونی لەپێش ئەوەیە کە دەریای (الروم و القلزم)بێت واتە (بحر الأبيض و بحر الأحمر) دەریای سپی و دەریای سوور. ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا﴾(الكهف ٦١).

﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا﴾(الكهف:٦١)واتە: شوێنی بەیەك گەیشتنی دوو دەریاکە، هەندێك لە زانایان ووتویانە: (مجمع البحرين) واتە: کۆبوونەوەی هەردوو (بحر) دەریای (شەریعەت و حەقیقەت)ە، ئەمە شیوازێکە لە جۆری ناوناکە، کە بەیەك گەیشتنی موسا (عليه السلام) و (خضر)ە.

موسا (عليه السلام) و لاوەکە هەردووکیان ڕۆیشتن تا گەیشتنە شوێنە دیاری کراوەکە، لەبەر هیلاکی زۆر هەردووکیان خەویان پیاکەوت، لەو کاتەدا ئەو ماسییەی ناو زەمیلەکەیان کەوتە جوڵە جوڵ و، لە زەمیلەکە خۆی فڕێ دایە دەر و بەرەو دەریاکە چوو، و خۆی تیا نوقم کرد.

﴿فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا﴾ (الكهف: ٦٢).

کاتێك هەردوکیان لە خەوەکەیان خەبەریان بویەوە، ڕێگایان گرتە بەر و ڕۆیشتن، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە لەو ماسییەی کە لە بیریان چوو بوو، هەر بەردەوام بوون لەسەر ڕۆیشتن، تا زۆر ماندو بوون، ئینجا دانیشتن بۆ ئەوەی ماندویەتیان دەرچێت، لێرەدا و لەم کاتەدا موسا (عليه السلام) داوای کرد لە لاوەکەی کە خواردنەکە ئامادە بکات، کە لەناو زەمیلەکەدا بوو لەگەڵ ماسییەکەدا، وەڵامی (یوشع) لاوەکە بریتی بوو لە:

﴿قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ

وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا﴾(الكهف:٦٣).

**باسکراوە کە موسا (علیه السلام) فەرمانی چاودێری و پاراستنی ماسییەکەی سپارد بە (یوشع) لاوەکە، بەوەی کاتێك ماسییەکە جوڵەی تێ کەوت، هەواڵی بداتێ، بەلاّم (یوشع) ووتی: ئەمە کارێکی ئاسانە، بەلاّم لە بیری چویەوە لەو کاتەی کە پێویست بوو لێی ئاگادار بێت، لەگەلّ ئەوەدا ووتی: ئایا ئەو بەردە گەورەیەت بیر دێت کە لە تەنیشتیدا پشوماندا، ئا لەوێ ماسییەکە لە زەمیلەکە دەرپەڕی و ڕێگای خۆی لە دەریاکەدا گرت و ڕۆیشت، منیش کە ئەو کارەم بینی زۆر سەرم سوڕما ئەوەی کە لەبیری بردمەوە تەنها شەیتان بوو کە بۆتی باس بکەم، موسا (علیه السلام) موناقەشەی لاوەکەی نەکرد لەسەر ئەم لەبیرچونەوەیە، کە نیوەی ڕۆژێك ڕێیان بڕی بوو، بەڵکو زۆر دڵی خۆشبوو، پێی ووت: ئەوە ئەو مەبەستە بوو کە دەمانویست، ئینجا بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە جێ پێکانیان هەڵدەگرت، تا بگەڕێنەوە هەمان شوێن کە لای بەردە گەورەکە بوو، کە شوێنی گەیشتنیانە بە (خضر) بەندە چاکەکارەکە. لە خۆشیدا هەرچی ماندو بوون بوو لە بیریان چویەوە، لەلای بەردەکەدا پێی دەگەن، شوێنی دەرچونی ماسییەکەش لە زەمیلەکە بۆ ناو دەریاکە، ڕێگایەکی لەناو دەریاکەدا جێ هێشتبوو کە وەکو تاقی هەڵکەندراوی لێ کردبوو، ئاوەکە ڕاوەستا بوو، وەك ئەو شێوەیەی کە ماسییەکە خۆی تێ فڕێدا بوو. کە ئەمەیش نیشانەیەکی ڕوونە و لەسەر شوێنەکە و هیچ گرفتێکی تیا نییە. لەو شوێنەدا کە ئاوڕێکیان دایەوە، بینیان پیاوێك لای بەردەکەدایە، خۆی بە بەرگێك داپۆشیوە، ئینجا موسا (علیه السلام) سەلامی لێکرد، بەندەکە پێی وت: کەی لەم زەوییەی تۆدا سەلام هەیە؟! سەری سوڕما لێی لە سەلام کردنەکە لە زەوییەکدا، کە لەم دەستەواژەی سەلامە بەتاڵە، زانی کە ئەو کەسەی سەلامەکەی لێ کردوە غەریبە ئینجا وتی: من موسام، ئەو وتی: تۆ ئەو**

**موسایەیت کە بۆ نەوەی ئیسرائیل نێردراویت؟ فەرمووی: بەڵێ، هاتوم بۆ لای تۆ تا هەندێك لەو زانستەی خۆتم فێر بکەیت کە لێی فێر بویت و بەهرەدار بوویت. خوای گەورە (خضر)ی بە (زانست)ەوە باسکردوە:** ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(**الكهف: ٦٥**).

**وتراوە: (الرحمة) واتە: پێغەمبەرایەتی، و (العلم) واتە: خوای گەورە لە هەندێك لە شاراوەکان ئاگاداری کردوە، کەلە چیرۆکەکەدا دەردەکەوێت.**

﴿قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ (**الكهف:٦٦**)

**موسا (علیه السلام) بە (خضر)ی وت: ئایا مۆڵەتم دەدەیت هاورێیەتیت بکەم و شوێنت بکەوم لەسەر ئەوەی کە هەندێك لەو زانست و عیلمەتم فێر بکەیت کە لەلایەن پەروەردگارتەوە فێرکراویت، کە زانستە بۆ ڕێنمایی و دۆزینەوەی خەیر؟**

﴿قَالَ لَهُ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ﴾(الكهف:٦٦) **بەڕاستی موسا (علیه السلام) ئەدەبێکی زۆر جوانی نواند لەگەڵ ئەو کەسەدا کە لەو زاناتر بوو تا زانستی لێوە فێر ببێت، و لەسەرو هەموو خاوەن زانستێکەوە کەسێکی زانا و شارەزاتر هەیە، ئەدەبی جوان لەگەڵ ئەو کەسەدا کە لێوەی فێردەبێت؛ لە پێویستییەکانی فێربوون، هەندێك لە زانایان و مامۆستایان بە قوتابییەکانیان دەڵێن: ئەی کوڕی خۆم، ئێمە زۆر زیاتر لە زانستەکەت پێویستمان بە ئەدەبی جوانتە.**

﴿قَالَ لَهُ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ..﴾(الكهف:٦٦) **پرسیارەکە شێوەی ئەدەبی جوانی تیایە، ئایا ڕێگەم پێ دەدەیت لێتەوە فێر ببم، موسا (علیه السلام) نەیفەرموو: پاش تۆزێکی تر دوات دەکەوم و پێویستە لەسەرت کە فێرم بکەیت.**

**(القاضي) دەڵێت: لەم کارەدا ئەوپەڕی لێبوردەیی و ئەدەبی جوان ڕەچاوکراوە، موسا (علیه السلام) خۆی بەدوور لە زانیاری باسکرد، و داوای مۆڵەتی لێ کرد کە شوێنی بکەوێت، و داوای لێ کرد کە ڕێنمایی بکات و**

هەڵوێستەمان لەسەر نەکردووە بەڵکو ئەوانە لە ڕیزی گێڕانەوەی (إسرائيليات) دان، و گێڕانەوەی دەمی خەڵکن.

بەڵکو بۆچوون و لێکدانەوەی (صحیح)و ڕاست لە هەندێك هەواڵ و گێڕانەوەدایە کە بریتییە لە زیندوو بوونەوەی (ماسی)یەکە کە مردبوو کە باسی لە چیرۆکی موسا و (خضر)دا هاتووە، کاتێك بەشێك ئاوی دەریاکەی بەرکەوت..

## باسی دووەم:

## وتە و بۆچونەکان لەسەر مردنی

کۆمەڵێك بۆچونیان وایە کە بەڕاستی (خضر) مردوە و لە ژیاندا نەماوە.

زۆرینەی ئەوانە لە (المحدیثین) زانا نوێکانی ئەم سەردەمە نزیکەن، کە بۆچونیان وایە مردووە.[١١٢]

زانای تەفسیر (الآلوسي) لە (أبي یعلی)ەوە کۆمەڵێك بۆچونی وەك وەڵام و ڕەتدانەوە هێناوە لەسەر ئەو کەسانەی کە دەڵێن (خضر) زیندووە، کە ڕوون کراونەتەوە و گونجاون، بریتین لە:

<u>یەکەم</u>: ئەو کەسانەی کە دەڵێن زیندوە، دەڵێن: بەڕاستی نەوەی ئادەم بووە و لەپشتی ئەو هاتووە، ئەمەیش لەدوو ڕووەوە (فاسد) هەڵە و نادروستە:

<u>ڕووی یەکەم</u>: بەڕاستی پێویست دەکات کە ئەمڕۆ تەمەنی نزیکەی (٦٠٠٠) شەش هەزار ساڵ ببێت یان زیاتر، نمونەی ئەمەیش دوورە لە عادات و مافی بەشەردا.

---

[112] - روح البيان ٢/٤٩٩

<u>ڕووی دووەم</u>: ئەگەر وا دانرا لەپشتی ئادەم هاتووە و نەوەی ئەوە یان چوارەم کوڕی بێت وەك هەندێك وای لێك دەدەنەوە کە وەزیری (ذي القرنين)ە، ئەوا بەڕاستی شێوازی جەستەی گۆڕاوە و بالاّ بەرزی و قەڵەوی تێپەڕی کردووە، لە هەردوو (صحيح)دا لە (أبي هريرة)ەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ئادەم دروستکرا درێژیەکەی (٦٠) شەست (ذراع) بوو، ئیتر بەردەوام لە دوای ئەو بەرەو کورت بونەوە دەچن).[١١٣]

ئەو کەسانەیشی کە دەڵێن: (خضر)مان بینیوە، نەیان وتووە شێوە و هەیکەلی گەورە بووە.

<u>دووەم</u>: ئەگەر (خضر) پێش نوح (عليه السلام) بوو بێت، ئەوا بەڕاستی لەگەڵیاندا سواری کەشتییەکە دەبوو کەسیش ئەم بۆچونەی نەقڵ نەکردووە.!

<u>سێیەم</u>: زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە نوح (عليه السلام) کاتێك لە کەشتییەکە دابەزین و دەرچوون تەنها نەوەکانی خۆی نەبێت هەرچی لەگەڵیدا بوو مرد، بەڵگەیش ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئانە: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾(الصافات: ٧٧).

<u>چوارەم</u>: ئەگەر ڕاست بوایە کە کەسێك لە سەردەمی ئادەم (عليه السلام) بمایەتەوە تا نزیکی وێران بوونی دونیا و کۆتایی هاتنی، ئەوا بەڕاستی دەبویە گەورەترین نیشانە و ئایەتی سەرسوڕهێنەر و هەواڵەکە لە چەند شوێنێکی قورئاندا باس دەکرا، چونکە ئەوە لە ئایەت و نیشانەکانی

---

113 – دەقی فەرمودەکە لە (مسلم)دا بەم جۆرەیە: {خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا} فەرمودەیەکی درێژە، کتاب الجنة و صفة نعيمها وأهلها، باب: يدخل الجنة اقوام افئدتهم مثل افئدة الطير. لە (صحيح)ی (بخاري)دا: كتاب الأنبياء، باب: قول الله تعالى﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ﴾ ١٠٢/٤.

هەروەها (إبن الجوزي) بەم بەشەی فەرمودەکە بەڵگەی هێناوەتەوە، سەیری (الأصابة) ١٢١/٢ بکە.

(الربوبية)تن، خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەوەی کردووە کە نوح پێغەمبەر (عليه السلام) (٩٥٠) ساڵ ژیاوە و کردویەتییە نیشانەیەك، ئیتر چۆن خوای گەورە ئەگەر لەوە زیاتر هەبێت باسی ناکات؟!

پێنجەم: بەڕاستی وتە و بۆچون لەسەر زیندویی (خضر) ئەوە قسە کردنە لەسەر خوا و بەبێ زانست ئەویش بە پێی دەقی قورئان حەرامە. ئەگەر ژیانی جێگیر بوایە و زیندوو بوایە، بەڕاستی قورئان یان (السنه) یان (إجماع الأمة) بەڵگەیان لەسەر دەدا، ئەوە قورئانی پیرۆز لە کوێیدایە باسی زیندویی (خضر)؟ ئەوە سوننەت و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە کوێدا لە ڕویەکەوە بەڵگەی لەسەر ئەوە هێناوە؟ ئەوە زانایانی ئوممەت لە کوێدا کۆبونەتەوە لەسەر ژیانی و زیندویی؟.

شەشەم: ئەوەی کە هەیە و دەستی پێوە دەگیرێت لەسەر زیندویی و ژیانی گێڕانەوەی دەما و دەمە، کەسێك هەواڵ دەدات کە (خضر)ی بینیوە، بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرە!! ئایا (خضر) نیشانەیەکی هەیە تا خەڵکی بینیان بیناسنەوە؟! هەر کەس بانگەشەی ئەوە دەکات کە بینیوەیەتی ئەوا بە قسەکانی لە خۆی بایی دەبێت کە دەڵێن: من (خضر)م! ئەوەیش زانراوە کە نابێت بەبێ بەڵگە ئەوە بەڕاست بزانرێت و باوەڕی پێ بکرێت، هەر کەس شتێکی لەو جۆرەی ووت، ئایا ئەو کەسە کە دەڵێت بینیومە لە کوێ باوەڕی پێ دەکات و بەدرۆی نازانێت؟!

حەوتەم: بەڕاستی (خضر) لە (موسى ی کوڕی عمران) جیابوویەوە، موسا (کلیم الرحمن) بوو، قسەی لەگەڵ خودا کرد بوو، پاشتر هاوەڵی نەکرد، (خضر) فەرمووی: ﴿هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾ ئیتر (خضر) کاتێك لە (موسا) (عليه السلام) جیابۆتەوە، چۆن بەوە ڕازی دەبێت لەگەڵ بەندە نەفامەکان و لە شەریعەت دەرچووەکاندا کۆ ببێتەوە، کە ئامادەی نوێژی جومعە و جەماعەت

نابن و ناچنە ناو کۆڕ و مەجلیسی عیلمەوە، هەر یەك لەو کەسانە دەڵێت: (خضر) ئەوەی بە من ووت..(خضر) هات بۆ لام....(خضر) ئامۆژگاری کردم، بەڕاستی ئەمانە سەیرن! ئایا (خضر) لە موسای (کلیم) جیا دەبێتەوە و دەچێت هاوەڵی ئەو کەسانە دەکات کە هاوەڵی شەیتان دەکەن!..پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە!.

<u>هەشتەم</u>: بەڕاستی ئوممەت لەسەر ئەوە کۆدەنگن، کە ئەو کەسەی دەڵێت: من (خضر)م، ئەگەر ووتبێتی: من لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە ئەوە و ئەوەی گوتووە، ئەوا ئاوڕی نەداوەتەوە بەلای قسەکەیدا و لە دینیشدا بە بەڵگە نەیهێناوەتەوە، کەسێك ئەوە بڵێت، بەوە ڕزگاری نابێت، مەگەر بڵێت: بەڕاستی ئەوە لە پێغەمبەرەوە نەهاتووە و ئەویش بەڵێنی پێنەداوە، و بەڕاستی ئەوەیشی بۆ نەناردووە، ئەمەیش لە کوفر زیاتر هیچی تیا نییە.!

<u>نۆیەم</u>: ئەگەر زیندو بووایە جەنگ و جیهادی لەگەڵ کافران دەکرد، و خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕێگای خوا و هەموو کات لە ڕیزدا ئامادە بوو، و ئامادەی نوێژی جومعە و جەماعەت دەبوو و ڕێنمایی کەسە بێئاگا و نەفامەکانی دەکرد، ئەم کارانەی لەوە پیرۆزتر و گەورەترن وەك دەڵێن: خەریکی گەڕانە بە ناو گیانلەبەران و چۆڵەوانیدا...و شتانی تریش[١١٤]. دەڵێن ئەمە بەڵگەی عەقڵییە کە (إبن الجوزي) لە کتێبی: (عجالة المنتظر..)دا هێناویێتی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن بە زیندویی ماوەتەوە.

(أبو إسحاق الثعلبي) هێناویێتی دەڵێت: بەڕاستی ئەو پێغەمبەرێکی خاوەن تەمەنێکی دیاری کراو بووە لەسەر هەموو بۆچونەکان لەبەرچاوی زۆربەی خەڵك شاراوە بووە.[١١٥]

---

114 – روح المعاني، ٣٢١/١٥ بەدەسکارییەوە

115 –تهذيب الأسماء و اللغات ١/ ١٧٧ ، روح المعاني ٣٢٢/١٥.

ڕەنگە پرسیار لە نێوان خەڵکدا دروست ببێت، حیکمەتی چییە پێغەمبەرێك هەبێت، و ئاستی هێنانەوەی بەڵگەی شەرعی لەسەر ئەم قسەیە لە کوێدا بێت؟.

ئەوەی کە (الثعلبی) هێناویێتی بەڵگەمان لەسەر نەبینیوە تەنها ئەوە نەبێت کە (إبن المنذر) و (إبن أبي حاتم) لە (أبي العالية)ەوە و ئەویش لە ڕێگای (حماد بن زید) و ئەویش لە (شعیب بن الحبحاب)ەوە (تخریج)یان کردووە کە دەڵێت: (خضر) بەندەیەك بوو چاو نەی دەبینی تەنها ئەوانە نەبێت کە خوای گەورە خۆی دەیویست بیبینێت لە قەومەکە کەس نەیبینی تەنها موسا نەبێت. خۆ ئەگەر قەومەکە بیان بینیایە، ئەوا نێوان (خضر) و نێوان عەیبدار کردنی کەشتییەکە دوور دەبوو، هەروەها نێوان (خضر) و کوشتنی منالە بێتاوەنەکەیش. زانا (الآوسی) ئەم هەواڵەی لە ناو چیرۆکی موسا لەگەڵ (خضر)دا (علیهما السلام) هێناوە، هەروەها تیایدا دەڵێت: ئەمە (مرفوع) نییە، خوای گەورە زاناترە بەڕاستییەکەی.[١١٦]

بەڵام -وەك لە (صحیح ی (مسلم)دا- هاتووە بەڕاستی خەڵکی ناو کەشتییەکە (خضر)یان ناسی و لەگەڵ موسادا (علیهما السلام) هەڵیان گرتن بەبێ کرێ.[١١٧]

لە ئایەتەکاندا تێپەڕی کە داوای خواردنیان کرد لە خەڵکی گوندەکە!

ئیتر لە کوێ ئەم بەڵگەیە بە ڕاست و جێگیر دادەنرێت کە لە (صحیح)دا پێچەوانەکەی هاتووە؟!

---

[116] - روح المعاني ، ٣٣٧/١٥ هەروەها بۆ ئەم هەواڵ و گێڕانەوەیە سەیری تەفسیری (القرطبی) بکە کە تیایدا ووتراوە: خەڵکی ناو کەشتییەکە دەرچوون بۆ (جزیرة) ئینجا (خضر) دواکەوت و کەشتییەکەی عەیبدار کرد ، و بێجگە لەمە شتی تریش وتراوە ١٣٩/١١.

[117] - صحیح مسلم بشرح النووي ١٣٩/١٥.

## بەڵگەی ئەو کەسانەی بۆچونیان وایە (خضر) مردووە

زۆرێك لە زانایان وای دەبینن (خضر) مردووە لەوانە: (البخاري، إبراهيم العربي، إبو الحسن بن المنادي، أبو الفرج بن الجوزي، إبن حزم الظاهري،[118] محمد بن أبي الفضل المرسي[119]، علي بن موسى الرضا، هەروەها القاضي أبو يعلى) مردنەکەی لە هەندێك لە هاوەڵەکانی (أحمد)ەوە گێڕاوەتەوە.[120] هەروەها ئەو کەسانەی دانیان ناوە بە مردنەکەیدا: (أبو بكر بن العربي،[121] أبو يعلى بن الفراء[122]، أبو الطاهر العبادي[123]، ابن القيم الجوزية)، (أبو الفرج بن الجوزى) پشتیوانی ئەم بۆچوونە دەکات کتێبێکی داناوە و ناوی ناوە: (عُجالة المنتظر في شرح حالَ الخضر) بە زۆر شت بەڵگەی تیا دێنێتەوە:

١- ئایەتی: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ﴾(الانبياء: ٣٤).

---

118 – الفصل في الملل والأهواء والنحل ١٨١/٤.

119 – ناوی (محمد بن عبدالله بن محمد بن ابي الفضل السلمي المرسي)یە زانای ئەدەب و تەفسیر و فەرموودەیە. الأعلام ٢٣٣/٦.

120- سەیری (روح المعاني) ٣٢٠/١٥ و المنار المنيف ص/٧٢ بکە.

121– ناوی (محمد بن عبدالله بن محمد المعافي الأشبيلي المالكي)یە (ابو بکر بن العربي) فەرموودەی لەبەربووە و شارەزا بووە لە ئەدەبدا و گەیشتۆتە پلەی (إجتهاد) لە زانستی دینیدا.

122– ناوی (محمد بن الحسين بن الفراء) بووە ، زانای سەردەمی خۆی بووە لە (الأصول والفروع و أنواع الفنون)دا، و خەڵکی (بغداد) بووە.

123-فتح الباري ٣١٠/٦ بۆ هەندێك لەم ناوانە سەیری (إرشاد الساري) ٥/ ٣٨٤ و (المنار المنيف) ص/٧٢ بکە.

(خضر) ئەگەر لە ڕەگەزی (بشر) بوو بێت ئەوا چۆتە ناو ئەم کۆمەڵە —واتە مردووە و لەژیاندا نەماوە— و چار نییە. ڕێگە بە تایبەتمەندکردنی ئەمەیش نادرێت مەگەر بە بەڵگەی ڕاست.

٢- هەروەها لەوانە ئایەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾(آل عمران:٨١).

(إبن عباس) دەفەرموێت: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە کە پەیمانی لێ وەرنەگرتبێت، بەڕاستی ئەگەر (محمد)ی نارد زیندو بوو، دەبێت هەموو کەس باوەڕی پێ بهێنێت و پشتیوانی بکات، هەروەها فەرمانیشی کرد بە (محمد) ﷺ کە پەیمان لە ئوممەتەکەی وەربگرێت، و ئەگەر بەڕاستی (محمد)ی ناردو ئەوان زیندوو بوون با باوەڕی پێ بهێنن و پشتیوانی بکەن. ئەمە (البخاري) باسی کردووە.[١٢٤]

ئەگەر (خضر) (ولي) یان (نبي) بووبێت ئەوا دەچێتە ناو ئەم پەیمانەوە، ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زیندوو بووبێت، ئەوا باشترین و بەڕێزترین حاڵی دەبوو کە لەبەردەم پێغەمبەردا بووایە، باوەڕی دەهێنا بەوەی کە بۆی دابەزی بوو پشتیوانیشی لێ دەکرد ئەگەر کەسێك لە دوژمنەکان بیویستایە دەستی بیگاتێ، چونکە ئەگەر (ولي) بوو بێت، ئەوە (صدیق) گەورەتر و لەپێشتر بووە، و ئەگەر (نبي) بووبێت، ئەوا موسا لەو گەورەتر و بەڕێزتر بووە، پێشەوا (احمد) لە (مسند)ەکەیدا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتییەوە دەفەرموێت: (سوێند بەو کەسەی نەفس و گیانی

---

124 - سەیری فەرموودەکە بکە لە (فتح الباري) ٦/٣١٠.

منی بە دەستە ئەگەر موسا ئێستا زیندو بوایە هیچی نەدەکرد تەنها ئەوە نەبێت کە شوێنی بکەوێت).[125]

ئایەتەکەی سورەتی (آل عمران:٨١) بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) لەسەردەمی پێغەمبەر محمد ﷺ زیندو بوونایە ئەوا تەکلیفی ئەوە لەسەر هەموویان دەبوو، کە شوێنکەوتەی ئەو بونایە و لەژێر فەرمانی ئەودا بونایە، هەروەها لەژێر هەموو شەریعەتەکەی ئەودا بوونایە.[126]

٣- ئەوە زانراوە کە بەڕاستی بە (سند)ێکی (صحیح) یان (حسن) نەقڵ نەکراوە کە لای پێغەمبەر دانشتبێت، نەبیسراوە و باس نەکراوە کە ڕۆژێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆبوبێتەوە، نەچۆتە جەنگەوە لەگەڵیاندا و دیمەنەکانی نەبینیوە. ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەنگی (بدر)دا دەفەرموێت: (ئەی خوایە ئەگەر ئەم دەستە و تاقمە لەناوبچن دواتر تۆ لەسەر زەویدا ناپەرسترێیت).[127] ئەو دەستە و تاقمە زۆرینەی موسڵمانان بوون لەو ڕۆژەدا هەروەها فریشتەکان تەنانەت (جبریل)یش لەوێ ئامادە بوو، ئەگەر (خضر) زیندو بوایە ئەوا دەبوو لەژێر ئەو ئاڵا و بەیداخەدا بوایە و لەو شوێنە بەڕێز و پیرۆزەدا بووایە.[128]

---

125- اخرجهُ الإمام احمد وأبو يعلى مِن حديث جابر.

126 -( القاضي ابو يعلى محمدبن الحسين الفراء الحنبلي) دەڵێت :دەربارەی (خضر) پرسیار کرا لە هەندێك هاوەڵانمان: ئایا مردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، پاشان فەرمووی، نموونەی ئەمەم لە (ابي طاهر العبادي)یەوە پێگەشتووە فەرمووی: بەوە بەڵگەی دەهێنایەوە ئەگەر زیندوو بوایە دەهات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە (إبن الجوزي) لە (العجالة...)دا نەقڵی کردووە ، سەیری (البداية والنهاية)ی (إبن كثير) ١/٣٣٥ بکە.

127 - صحيح مسلم ، كتاب الجهاد والسير باب الأمداد بالملائكة في غزوة البدر و إباحة الغنائم.

128 - کاتێك پرسیار لە (شيخ الأسلام إبن تيمية) کرا دەربارەی ژیان و زیندویی (خضر)، فەرمووی ئەگەر (خضر) زیندو بوایە، ئەوا بەڕاستی لەسەری (واجب) دەبوو کە بهاتایە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵیدا بجەنگایە و لێی فێر ببوایە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەنگی (بدر)دا

٤- ئەگەر (خضر) زیندوو بوایە و بمایە ئەوا لەو دەمەی پێغەمبەر ﷺ پەیامەکەی دەگەیاند و فەرموودەو ئایەتەکانی دەگێڕایەوە ئینکاری فەرموودە هەڵبەستراوەکان و گێڕانەوە پێچەوانەکان و بیر و بۆچوونە بیدعەکان و هەوا و ئارەزووە دەمارگیرییەکانی دەکرد و لە جەنگەکاندا لەگەڵ موسڵمانان پێکەوە جەنگی دەکرد وئامادەی نوێژی جومعە و جەماعەتەکانیان دەبوو، و سودی پێ دەگەیاندن و زیان و خراپەی لێ دوردەخستنەوە، ڕێنمایی زانا و کاربەدەستانی دەکرد و دانی بە بەڵگە و بڕیارە ڕاستەکانیاندا دەنا، ئەوەی کە بە چاك دەربارەی ئەو دەوترێت لە شار و شوێنە ئاوەدانەکاندا خۆی شاردبێتەوە و شاراوە بێت و لەگەڵ هەندێك لە بەندەکان کۆدەبێتەوە کە حاڵی زۆریان زانراو نییە.. ئەوەی کە باسمان کرد پاش تێگەشتن کەس هەڵوێستەی لەسەر ناکات، خوای گەورەش هەرکەسی بوێت هیدایەتی دەدات بۆ ڕێگای ڕاست.

٥- هەروەها لەو بەڵگانەی کە لە هەردوو (صحیح)دا و شوێنی تریشدا جێگیر کراوە، لە (عبدالله بن عمر)ەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان نوێژی عیشای دەکرد، پاشان فەرمووی: {أرأيتم ليلتكم هَذهِ فإنه إلى مائِة سَنَةٍ لا يبقى مِمَن هُوَ على وَجْهِ الأرضِ اليوم أحَدَاً}[١٢٩] واتە: (ئایا ئەم شەوەتان دەبینن و

---

فەرمووی: (اللهم إن تهلك هذه العصابة لا تعبد في الارض) سێ سەد و سیانزە کەس بوون، هەموویان بە ناوی خۆیان ۆ باوکیان و قەبیلەیان ناسراو بوون لەو کاتەدا (خضر) لەکوێ بوو؟ (المنار المنيف) ص/٦٨.

[129] – اخرجه مسلم وابو داود و الترمذي و احمد في مسنده، سەیری (الفتح الكبير) ٣/٢٤ بکە. (لفظ)ی (مسلم) بریتییە لە: (ارايتم ليلتكم هذه فإنّ على راس مائة سنة منها لايبقى ممن هُوَ على ظهر الأرضِ احد)). صحيح مسلم ، كتاب فضائل الصحابة. باب قوله ﷺ: (لاتاتي مائة سنة و على الأرضِ نفس منفوسة اليوم).

دەزانن، بەڕاستی تا سەد ساڵی تر ئەوەی کە ئێستا لەسەر ئەم ڕووی زەوییەیە، کەسی لێ نامێنێت).

(إبن الجوزی) پاش ئەوەی فەرمووده (صحیح)ەکان و ئەو فەرموودانەی کەلەم شێوەیە دەچن زۆر بەوردی گێڕاوەتەوە..

دەڵێت: ئەم فەرموودە ڕاستانە ئەو بانگەشانە دوابڕاو دەکەن کە دەڵێن (خضر) زیندووە و لە ژیاندا ماوە. (بەڵگەی تری زۆر لەسەر هاتووە بەڵام ئێمە ئەوەندەمان بەسە).

## بەشی شەشەم

## ئایا (خضر) دەگات بە خەڵکی؟!

### پێشەکی:

ئایا ڕاستە کە (خضر) بە خەڵکی دەگات و بۆیان دەدوێت ڕێنماییان دەکات بۆ خەیر وچاکە لە کاتی پێویستدا فریایان دەکەوێت؟

چۆن دەیناسن کە ئەوە (خضر)ە؟ پلەی ئەو گێڕانەوانە چۆنە و کە دەڵێن لە کۆن و نوێدا بە خەڵکی دەگات؟.

بەرنامە و مەنهەجمان لەم بەشەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١- ئامانج و مەبەست لە هێنانی هەندێك گێڕانەوە بۆ دەرخستنی بەڵگە ڕاست و دروستەکانە بۆ ئەو کەسانەی کە وای دەبینن (خضر) زیندووە و ماوە. بەبێ ئەوەیش لێکۆڵینەوەکە تەواو نابێت.

٢- هێنانەوەی هەندێك لەو گێڕانەوانە کە ڕەخنەیان لێ گیراوە و نەچەشپاوە کە ڕوویان دابێت، تا خوێنەر لایەنی لاوازی و درووستکراوی گێڕانەوەکەی بۆ ڕوون بێتەوە.

٣- تەواو کردنی لایەنەکانی ناو لێکۆڵینەوەکە بە هێنان و هەڵبژاردنی هەندێك گێڕانەوە بۆ هەموو دەستەکانی کۆمەڵگا کە لەم بەشەدا دابەش کراون و جیاکراونەتەوە، مەبەست لە هێنانیشیان بۆ پەند و ئامۆژگاری و ڕێنماییە... لەسەر ئەوە نا کە ڕاستن.

## بەیەکگەیشتنی پێش موسا (علیه السلام)

**وتراوە: (خضر) نەوەی باوکە ئادەمە و لە پشتی ئەو هاتووە.... [١٣٠]**

**(أبو حامد السجستانی) وتویەتی (خضر) کوڕی (قابیلی) کوڕی (أدم) بوو. [١٣١]**

**(وهب بن منبه)یش نەسەبەکەی گەیاندۆتەوە بە (سام ی کوڕی نوح) (علیه السلام). [١٣٢]**

**هەروەها ڕا و بۆچونی جیاواز لەسەر ئەوە هاتووە. کە باوەڕی بە (إبراهیم) (علیه السلام) هێنا بێت یان پێش ئەو بووە. [١٣٣]**

**هەروەها ئەوەیشی دەربارە هاتووە کە لە نەوەی (إسرائیل) بووە لە زەمانی فیرعەوندا. [١٣٤]**

**لە (الکشاف)دا هاتووە: لە ڕۆژەکانی سەردەمی (أفریدون)دا بووە.**

**-پێش موسا (علیه السلام) و لە سەرەتای (ذي القرنین)ی گەورەدا بووە و تا سەردەمی موسا (علیه السلام) ماوەتەوە. [١٣٥]**

---

[130] - ئەوە لە (عبدالله بن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە (إبن کثیر) دەربارەی ئەم هەواڵە دەڵێت ، بەڕاستی (منقطع و غریب)ە. سەیری (البدایة والنهایة) ٣٢٦/١ بکە.

[131] - رواه عن (أبي عبیدة و غیره) سەیری (فتح الباري) ٣٠٩/٦ و (إرشاد الساري) ٣٨٤/٥ بکە.

[132] - روح المعاني ٣٢٠/١٥.

[133] - البدایة والنهایة ٣٢٦/١ و فتح الباري ٣١٠/٦ و إرشاد الساري ٥/ ٣٨٣.

[134] - البدایة والنهایة ٣٢٦/١.

[135] -الکشاف للزمخشری ٥٧٤/١.

ئامانە چەند وتە و بۆچوونێکی جیاواز بوون بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، چونکە بە بەڵگەی دەقێکی ڕاست و یەکلاکەرەوە ساغ نەبوونەتەوە، بەڵکو بۆچوونی (إسرائیلیات)ن یان گێڕانەوەی مێژویین و ڕاستییان جێگیر نییە.

گێڕانەوەیەك هەیە لەناو خەڵکیدا بەناوبانگە، باسی ئەوە دەکەن کە (خضر) گەیشتووە بە پیاوێکی هەژار کاتێك لەناو بازاڕی (بني إسرائیل)دا بووە، ئێمە کورتەیەکی لێ وەر دەگرین وەك (إبن کثیر) لە (تأریخ)ەکەیدا هێناویەتی:

لە (أبي أمامة الباهلي)یەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: ئایا دەربارەی (خضر) بۆتان بدوێم؟ وتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ڕۆژێکیان (خضر) بەناو بازاڕی (بني إسرائیل)دا دەڕۆیشت پیاوێکی هەژار چاوی پێکەوت. وتی: خوا بەرەکەتدارت بکات یارمەتیم بدە و خەیرم پێ بکە. (خضر) فەرمووی: (امنتُ باللهِ) باوەڕم هێنا بە خوا، خوا هەر کارێکی بووێت دەبێت. هیچم لانییە من بتدەمێ، هەژارەکە وتی:...تکای بەرەکەتم لە تۆدا کردووە؟ (خضر) فەرمووی:...تەنها ئەوە شك دەبەم بم بەیت بمفرۆشیت. هەژارەکە وتی، ئایا ئەوە ڕاستە و جێبەجێ دەبێت؟ فەرموی بەڵێ...فرۆشتی بە چوارسەد درهەم. ماوەیەك لای کڕیارەکە مایەوە و لە هیچ شتێکدا بەکاری نەدەهێنا، (خضر) وتی: تۆ دەمفرۆشیت تا خێرێکت لێم دەست بکەوێت، ئامۆژگاریم بکە بە کارێك بۆت بکەم، ئەویش وتی: پێم ناخۆش و قورسە زۆرت لێ بکەم، تۆ پیاوێکی بە تەمەن و لاوازیت، وتی: قورس نییە لەسەرم. ئەویش وتی: ئەو کۆمەڵە بەردەم بۆ بگوێزەرەوە —کە دەبوو لە ڕۆژێکدا بە شەش کەس بیانگوێزایەتەوە—... لە کۆتایدا (خضر) وتی: حەزدەکەم وازم لێ بهێنیت ڕێگای خۆم بگرم و پەروەردگارم بپەرستم. ئەویش ئازادی کرد ئینجا (خضر) وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی خستە ناو بەندایەتی و پاشان ڕزگاری کردم.). دەبێت پلەی ڕاستی ئەم فەرمودەیە لە کوێدا بێت؟.

(إبن كثير) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە هەڵەیە و (مرفوع) و زیاتر لەوەیش دەچێت کە (موقوف) بێت، هەروەها لە پیاوانی سەنەدەکەیشی ناناسرێن. خوا زاناترە.

## گەیشتنی (خضر) بە (إلیاس) (علیه السلام)

هەواڵ و گێڕانەوەی زۆر هاتوون دەربارەی ژیانی(إلیاس) و (خضر) (علیهما السلام) کە لەیەك نزیك بووبێتن یان نا، یان هەندێکیان بە هەندێکیان گەیشتبێت.

هەروەها لێرەدا ئاڵۆزی و گرفتەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ژیانی (إلیاس)یش (علیه السلام) هەندێك بەڵگەمان لەسەر ژیان و زیندویی (خضر) باسکرد، وەڵام و ڕەتدانەوەیان لەسەر بوو، بەڵام (إلیاس) (علیه السلام) کامە بەڵگەیە لەسەر مانەوەی لە ژیاندا؟ دەبینین کە هیچ فەرمودەیەکی (صحیح) نەهاتووە سودێك بگەیەنێت لەسەر ئەوەی کە (إلیاس) ماوە. یان گەیشتبێت بە (خضر)!.

ڕا و بۆچوونی جیاوازیش لەسەر ئەوە هاتووە کە (إلیاس) کێیە؟ (إبن مردویة) لە (إبن عباس)ەوە (تخریج)ی کردووە کە (خضر) بووە.[١٣٦] هەروەها (الألوسي) ئەو هەواڵەی هێناوە و ووتویەتی: ئەوە (باطل) بەتاڵە.[١٣٧]

ووتراوە: (إدریس) بووە.[١٣٨]

---

136 -الفتح الكبير في ضم الزيادة إلى الجامع الصغير ٢/١٠٥ الفتاوى الرملية ص/٢٢٣.

137 -روح المعاني ١٥/٣١٩.

138 -فتاوى الرملي الذي بهامش الفتاوى الكبرى الفقهية لإبن حجر ص /٢٢٣.

خاوەنی (اسنی المطالب) هەواڵێك دێنێت و دەڵێت: هاتووە کە (خضر) لەگەڵ (إلیاس) (علیهما السلام) هەموو ساڵێك لە وەرزێکدا کۆدەبێتەوە. بەڵام (سند)ەکەی ڕاست نییە. (المناوي) دەڵێت: (ضعیف)ە (إبن الحجر) و (السخاوي) دەڵێن: (منکر)ە، ئەگەر وایش دانرا ڕاستە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (إلیاس) زیندووە، هەروەها ئەوەش (باطل) بەتاڵە.[١٣٩]

ئەمانە قسە و بۆچوون و گێڕانەوەی زۆر غەریبن....(الحافظ إبن حجر) گێڕانەوەی درێژی دەربارەی (إلیاس) و جۆری خواردنەکانی هێناوە کە لەگەڵ (خضر)دا دەیان خوارد، کاتێك لە مانگی (رمضان) لە (بیت المقدس) بەیەك گەیشتن. یان لە (مککه). ئێمەیش وازمان لێ هێناون لەبەر درێژیان و نەگونجاویان کە زۆرن![١٤٠]

## ئەوەی دەربارەی بەیەك گەیشتنی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە

(إبن عساکر) لە (أبي داود الأعمی نفیع)ەوە –کە کەسێکی زۆر درۆزنە– لە (أنسی کوڕی مالك)ەوە، و لە ڕێگای (کثیر بن عبدالله بن عمرو بن عوف)ەوە –هەروەها ئەمیش کەسێکی زۆر درۆزنە– لە باوکییەوە –ئەویش لە باپیرییەوە: بەڕاستی شەوێکیان هات گوێی لە، پێغەمبەری خوا ﷺ گرت کە دەپاڕایەوە و دەیفەرمو: (اللهم أعنّي علی ماینجیني ممّا خوّفتني وارزقني شوقَ إلی ما شَوقتهم إلیه). ئینجا، پێغەمبەری خوا ﷺ (انسی کوڕی مالك)ی نارد بۆلای (خضر)، سەلامی لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و ووتی: بڵێ بەڕاستی خوای گەورە فەزڵی تۆی داوە بەسەر پێغەمبەراندا وەك فەزڵی

[١٣٩] –اسنی المطالب في أحادیث مختلفة المراتب ص/٢٩٦ هەروەها سەیری لاپەڕە (١١٤) بکە.
[١٤٠] –الإصابة ٢/١٢٤–١٢٧.

مانگی ڕەمەزانی داوە بەسەر گشت مانگەکاندا، وفەزڵی ئومەتەکەیشتی داوە بەسەر گشت ئومەتەکاندا وەك فەزڵی ڕۆژی جومعەی داوە بەسەر گشت ڕۆژەکانی غەیری خۆیدا).

ئەمە هەڵبەستراوە و درۆیە نە لە (سند) نە لە (متن) دەقدا ڕاست نییە.[١٤١]

(ألحافظ أبو الحسين بن المنادي) پاش هێنانی ئەم فەرموودەی (أنس) دەڵێت: (أهل الحديث) فەرموودەناسەکان هەموو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە (حديث)ێکی (منكر الأسناد) سەنەد هەڵەو ناڕێکە، هەروەها (سقيم المتن) واتە مەتنەکەی ناتەواو و نادروستە و شێوازی دروست کردنی پێوە دەردەکەوێت.[142]

## ئایا (خضر) بە (صحابي) هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەژمێردرێت؟

(الباجوري) دەڵێت: (صحابي) هاوەڵ ئەو کەسەیە کە بە باوەڕداری لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کۆبوبێتەوە پاش بوونی بەپێغەمبەر، بە جۆرێك کە پێغەمبەری بینیبێت و ناسیبێتی، دەبێت لەسەر ڕووی زەویدا بووبێت وەك عادەت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە ئاسماندا بووبێت یان لە نێوان ئاسمان و زەویدا بووبێت، و دەبێت لەسەر ئیسلام بوون مردبێت وەك مەرجی بەردەوام بوون لەسەر ڕاستی کارەکەی. پاشان ووتی: بزانە ئەگەر (عيسا) (عليهالسلام) لە (بيت المقدس) لەگەڵ پێغەمبەر کۆببێتەوە بە جەستە و ڕۆحەوە، ئەوە (صحابی) هاوەڵێتی، بۆ (خضر)یش هەر بەو جۆرەیە.[١٤٣]

---

141- البداية والنهاية ٣٣١/١.

142- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

143- حاشية الباجوري على شرح إبن قاسم الغذي على متن ابي شجاع ٧١/١.

خاوەنی (روح البیان) دەڵێت:...هەر بەو جۆرە ئەگەر (خضر) و (إلیاس) (علیهما السلام) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کۆببێتەوە و ناسیبێتیان، ئەوانیش بە (صحابي) هاوەڵی دەژمێردرێن.[١٤٤]

(الألوسي) دەڵێت: بەڕاستی کۆمەڵێك لە (أرباب الأصول) بە (صحابي) هاوەڵ دایان ناوە...لە کاتێکدا کەس نەبووە (سند)ێکی ڕاست و دروست بهێنێت لەسەر ژیانی ڕوونی بکاتەوە کە گەیشتووە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێك دەڵێن ئێمە ئەوە هەڵدەبژێرین کە بەڕاستی هاتووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بەیعەت و پەیمانی پێداوە، بەڵام بە شێوەی نهێنی و شاراوە کە کەس هەستی پێ نەکات.[١٤٥]

(أبو الخطاب بن دحیة) دەڵێت: جێگیر نابێت و دانامەزرێت کە (خضر) لەگەڵ هیچ یەکێك لە پێغەمبەراندا غەیری موسا (علیه السلام) کۆبوبێتەوە وەك خوای گەورە هەواڵەکەی بە چیرۆك گێڕاوەتەوە.[١٤٦]

## ئایا (خضر) هیچی لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوەتەوە؟

پاش هەموو ئەمانە....ئایا دەبێت بووترێت: (خضر) لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی گێڕاوەتەوە؟

هەموو بەڵگەکان دەڵێن: نەخێر...

تەنانەت (المحدثین) هەندێك لە زانا و لێکۆڵەرە نوێیەکان کە دەڵێن هێشتا زیندووە و لە ژیاندایە، هەموویان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە هیچ گێڕانەوە و ڕیوایەتێکی لە پێغەمبەری خوا ﷺ نییە.

تەنها ئەوە هەیە کە ڕا و بۆچوونی جیاوازە لای هەندێك لە (صوفي)یەکان...(الشیخ علاء الدین)[١٤٧] بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەبێ (واسطة) هۆکار فەرموودەی لە، پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە.[١٤٨]

---

[144] - روح البیان في تفسیر القرآن ٢/٥٠٦.

[145] – روح المعاني ١٥/ ٣٢٧.

[146] –الأ صابة الأبن حجر٢/١١٩.

(السهروردي) لە نهێنی شاراوەییدا باسی ئەوەی کردووە کە (خضر) (علیه السلام) سێ سەد فەرموودەی گێڕاوەتەوە بۆمان کە لە دەمی پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە.[149]

ئێمەیش لێرەدا دەڵێین: بەڕاستی ئەم قسەیە هیچ بەڵگەیەکی نییە مەگەر کاتێك کە بە فەرموودەی ڕاست پشتگیری لێ بکرێت و فەرموودەکانیش لەلایەن زانا نوێ و شارەزاکانەوە (تخریج) بکرێن،... ئەگینا ئەمە لە کوێ؟! بەڵکو تەنها یەك فەرموودەی ڕاستیش نییە کە لە یاسا و لێکۆڵینەوەی زانا نوێکاندا ڕاست بێت و جێگای متمانە بێت، چونکە بە سەنەدێکی ڕاست ساغ نەبۆتەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوبێتەوە.... وەك پێشتر باسمان کرد (جمهور المحدثین) زۆرینەی نوێکان بۆچونیان وایە کە لە ژیاندا نەماوە و مردووە.

## کۆبوونەوە لەگەڵ هاوەڵان

گێڕانەوەکان دەربارەی (التعزیة) پرسە:

چەند گێڕانەوەیەك هاتوون دەربارەی پرسە گرتنی (خضر) بۆ (أهل البیت) پاش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردبوو... هەندێك لە (کتێبە فیقهییەکان) لە بەشی (التعزیة)دا ئەو گێڕانەوانە دێنن، کە شێواز و ڕێگای گێڕانەوەکان جیاوازن دانەیەکیان بە نموونە دەهێنینەوە:

---

[147]- هەر بەو جۆرەیش (الألوسي) لە (روح المعاني)دا هێناویەتی ٣٢٣/١٥. کە لە کتێبی (الحذر من أمر الخضر)ی (الملا علی القاري) ص/٨٩نەقڵ کراوە.

[148]- روح المعاني ٣٢٣/١٥.

[149]- هەمان سەرچاوە.

ئەم هەواڵە (الحافظ أبو بكر البيهقي) گێڕاویەتیەوە، سەنەدەکەی بەم جۆرەیە:

(أبو عبدالله الحافظ) هەواڵی پێداین، (أبو بكر بن بالوية) هەواڵی پێداین، (محمد بن بشر بن مطر) بۆمان دوا، (كامل بن طلعة) بۆمان دوا، (عباد بن عبد الصمد) بۆمان دواوە، لە (أنس کوڕی مالك)ەوە....کە تێیدا هاتووە: بەڕاستی (خضر) لەناو هاوەڵاندا ڕاوەستا، دەست ـ کرد بە گریان و سەرەخۆشی لێ کردن، پاش ئەوە دیار نەما و وون بوو، و (علي) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: بەڕاستی ئەوە برای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، کە (خضر) بوو.[١٥٠]

– تەحقیق و لێکۆڵینەوە لەسەر فەرموودەکە:

لە سەنەدی گێڕانەوەکەی (البيهقي)دا (عباد بن عبد الصمد) هاتووە (البيهقي) دەربارەی دەڵێت: (ضعيف)ە.[١٥١]

(إبن حبان) و (العقيلي) دەڵێن: زۆربەی گێڕانەوەکان (موضوع) هەڵبەستراوە. (البخاري) دەڵێت: (منكر الحديث)ە (أبو الحاتم) دەڵێت: (ضعيف الحديث جداً منكره) و (إبن عدي) دەڵێت: هەموو ئەوانەی ئەو ڕیوایەتی دەکات لە (فضل)ی (علي)دایە، دەڵێت: زۆر (ضعيف)ە و بریتییە لە (التشيّع) بە شیعەکردن.[١٥٢]

(گێڕانەوەکان زۆرن ودرێژن، ئێمە ئەوەندەمان بۆ نموونە بەسە).

---

150 – سەیری (الفتح الباري) ٦/٣١١ والبداية والنهاية ١/٣٣١-٣٣٢ بکە.

151 - سەیری البداية والنهاية ١/٣٣٢ بکە.

152 - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## کۆبوونەوەی لەگەڵ خەلیفە و کاربەدەستەکان

هەواڵ دەربارەی هاتووە، باسی ئەوە دەکات کە لەگەڵ هەندێك لە خەلیفەکاندا کۆ بووبێتەوە.!

* یەکێك لەو گێڕانەوانە (أبو بكر الدينوري) لە (المجالسة)دا، لە ڕێگای (إبراهيم بن خالد) لە (عمر بن عبدالعزيز)ەوە گێڕاویەتییەوە دەڵێت: من (خضر)م بینی کە زۆر بە خێرایی هەنگاوی دەنا و دەڕۆیشت و دەیووت: {صبراً يا نفس صبراً لِأيامٍ تفقد لِتلك أيام الأبد، صبراً لأيامِ القصار لِتلك الأيام الطوال}.[١٥٣]

## کۆبوونەوەی لەگەڵ زانا و پیاوچاکان و خواناسان

لە (بحر المحيط)دا (قاضي القضاة إبن دقيق العيد) لە (شێخ)ێکییەوە هەواڵ دەگێڕێتەوە دەڵێت: بەڕاستی ئەو (خضر)ی بینیوە و قسەی لەگەڵ کردووە، پێی ووترا: کێ فێری کردیت و پێی ووتیت ئەوە (خضر)ە؟ و لە کوێ ناسیت ئەوە؟ بێدەنگ بوو.[١٥٤]

* (عبدالمغيث بن زهير العربي)[١٥٥] باسی کردووە لە بەشێکدا کە دەربارەی هەواڵی (خضر) کۆی کردۆتەوە، لە (معروف الكرخي)یەوە کە ووتویەتی: (خضر) بۆم دووا، (إبن الجوزي) ووتی: ئەمە لە کوێ ڕاست دەبێت کە لە (معروف) ڕووی دابێت.[١٥٦]

---

153- الأصابة لأبن حجر ١٣٥/٢.

154 - تفسير البحر المحيط لأبي حيان الأندلسي ١٤٧/٦.

155 -(محدث)ێکی خەڵکی (بغداد) بووە ، لە پیاوچاکانی (الحنابلة) بووە (مصنف)ێکی لە (فضل يزيد بن معاوية) هەیە ، (إبن كثير) دەڵێت : شتی غەریب و عەجیبی تێدا هێناوە ، (إبن الجوزي) ڕەدی داوەتەوە، لە ساڵی (٥٨٣) ﻫ کۆچی دوایی کردووە، الأعلام ١٥٥/٤ ط ٨.

156 -الأصابة لأبن حجر ١٣٧/٢.

* هەروەها ڕیوایەت کراوە کە (خضر) (علیه السلام) لەگەڵ (أبي حنيفة)دا کۆبۆتەوە و زانستی شەرعی لێوە فێر بووە! خاوەنی (الأشاعة لِأشراط الساعة) قسەی (الملا علی القاري الهروي)[157] هێناوە لە کتێبەکەیدا کە ناوی (المشرب الوردي في مذهب المهدي)یە ڕەدی کۆمەڵێك نەفام و نەزانی تیا داوەتەوە کە چیرۆك و گێڕانەوەیان لە سەرچاوە نادیارەکانەوە هێناوە، لە سەرەتادا حیکایەتێکی باسکردووە کە هەندێك کەسی نەزان و نەفام لەناو ئەو کەسانەدا کە (تعصب)یان بۆ (أبو حنيفة) هەیە بڵاویان کردۆتەوە و ڕەواجیان پێداوە، پاشان بە بەڵگەی بەهێز و (منطق) ڕەدی دەداتەوە، حیکایەتەکە زۆر درێژە ئەمە سەرەتاکەیەتی: بزانە کە بەڕاستی خوای گەورە (أبا حنيفة)ی بە شەریعەت و کەرامەت تایبەتمەند کردووە، لە کەرامەتەکانی بریتی بووە لەوەی کە هەموو ڕۆژێك (خضر) لە کاتی (صبح)دا هاتووە بۆ لای و بۆ ماوەی پێنج ساڵ ئەحکامی شەرعی لێوە فێر بووە، کاتێك (أبا حنيفة) وەفات دەکات، (خضر) لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە و دەڵێت: {إلهي إن كانَ لي عِندَك منزلة فأذن لابي حنيفة حتى يعلمني مِن القبر على حسب عاداتِهِ حتى أعلم شرع محمد ﷺ على الكمال..}[158]

(شیخ علي القاري) دەڵێت: شتێکی شاراوە نییە کە ئەمە قسەی (ملحد)ەکانە کە هەوڵ دەدەن بۆ خراپەکردن و ناشرین کردنی ئەم دینە بەڕاستی (خضر) ئەو کەسایەتییە بووە کە خوای گەورە دەربارەی فەرموویەتی: ﴿عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾(الكهف:٦٥). بەڕاستی موسا لەوەوە شت فێر بووە، ئێستا دەبێتە قوتابی (أبو حنيفه)؟!

---

157 – ناوی (نورالدین ملا علی بن سلطان القاري الهروي الحنفي)یە لە (هراة) لەدایك بووە پاشان کۆچی کردووە بۆ (مەککە) ساڵی (١٠١٤)ھ، وەفاتی کردووە.

158 - سەیری تەواوی حیکایەتەکە بکە لە کتێبی (الأشاعة لِأشراط الساعة)ی (شیخ محمد بن رسول الحسني البرزنجي) ص /٢٢٢-٢٢٥، وەك لە کتێبی (انیس الجلساء)ەوە نەقڵ کراوە.

## دەربارەی گەیشتن بە خەڵکی ئاسایی

دەربارەی گەیشتن بە خەڵکی ئاسایی ئەمە شتێکی بەناوبانگە...
ڕەنگە موسڵمانێك نەبێت کە هەواڵ و دەنگ و باسی (خضر)ی نەبیستبێت و ئەوەیشی بیستووە کە گەیشتووە بە خەڵکی... هەروەك ئەوەی کاتێك ناوەکەی باس بکرێت تێڕوانینێکی غەریب و ناوازە لای خەڵك دروست ببێت، ئەمەیش چونکە کەسایەتییەکی غەریب و سەیرە، کە نموونەی لە مێژوودا نەبووە.

هەواڵی زۆرە کە لە ناو خەڵکیدا باس دەکرێت و دەگێڕدرێتەوە لە شوێنە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامیدا، ئەو گێڕانەوانەیش بە زۆری لە دەرەوەی شار و لە گوند و شوێنە سنور بچوکەکاندا... چونکە خەڵکی ناو شارەکان ئەو ئامادە بوونەیان نییە لە ڕووی عەقڵی و نەفسییەوە تا ئەو هەواڵە غەریب و عەجیبانە وەربگرن کە لە واقیعەوە دوورن، ئەوان زیاتر پەیوەندییان بە ڕوداوە واقیعی و لەبەرچاوەکانەوەیە زیاتر لە خەڵکی گوندەکان لای هەندێك لە خەڵکی ئەوە شتێکی زانراوە کە دەڵێن گەیشتووە بە خەڵکی، بە تایبەتی بەو کەسانەی کە بار و گوزەرانیان نالەبارە و لە هیوا و ئومێدەکانی ژیان دابڕاون. بەڵام شارەکان هۆکارەکانی ژیانی باشی زیاتر تیا فەراهەم هاتووە لەبەر ئەوە باسەکەی لە لادێکاندا زیاترە....

گێڕانەوەیەك دێنن لەسەر ئەوەی کە گەشتووە بە خەڵکی:

(أبو عبدالله بن بطة العكبري الحنبلي) ووتی: (شعیب بن أحمد) بۆمان دووا، (أحمد بن أبی العوام) بۆمان دووا (باوکم) بۆمان دووا، (إبراهیم بن عبدالحمید الواسطي) بۆمان دووا، (أبین بن سفیان بن غالب بن عبدالله العقیلي) بۆمان

دووا، له (حسن البصري)یەوە ووتی: پیاوێك له (أهل السنة) ڕا و بۆچونێکی جیاوازی بۆ دروست بوو، و (غیلان القدري) له شتێکدا دەربارەی قەدەر، ڕازی بوون که یەکەم پیاو هاته لایان لەو ئاڕاستەیەوە که باسیان کردبوو بڕیار له نێوانیاندا بدات، پیاوێکی (أعرابي) دەشتەکی هاته لایان و عەباکەی پێچابوویەوە و دابووی بەسەر شانیدا، پێمان ووت: ڕازین که تۆ بڕیار له نێوانماندا بدەیت، ئینجا جلەکانی کۆکردەوە و لەسەری دانیشت، پاشان ووتی: دانیشن، هەردووکیان لەبەردەمیدا دانیشتن، بڕیاری لەسەر (غیلان)دا، (الحسن) ووتی: ئەوە (خضر) بوو. له (سند)ەکەدا (أیین بن سفیان) (متروك)ە.[١٥٩]

(إبن الجوزي) له (مناقب)ی (إمام أحمد)دا گێڕانەوەیەکی له (إسحاق بن إبراهیم البستي) هێناوە دەڵێت: له باوکمم بیست دەیووت: پیاوێکی خەڵکی (بغداد) ووتی: سواری کەشتییەك بووم له دەریادا، دەرچووین بەرەو جزیرەیەك، شێخێکم بینی دانیشتبوو، سەر و ڕیشی سپی بوو، منیش سەلامم لێ کرد، پێی ووتم: تۆ له کوێوە هاتوویت؟ ووتم: له خەڵکی (بغداد)م، ئینجا ووتی: کاتێك چویتەوە (بغداد) سەلام بکە له (أحمد بن حنبل) و ئەم ئایەتەی پێ بڵێ: ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾(الروم:٦٠).

ووتی: پاشان شێخەکە دیار نەما. ئیتر زانیمان که ئەوە (خضر)ە.[١٦٠]

---

159 -الأصابة لابن حجر ٢/١٣١-١٣٢.

160 - مناقب الأمام احمد بن حنبل ص ١٤٤-١٤٥.

## بۆچوونی زانایان لەسەر ئەم گێڕانەوانە

ئەمە حیکایەت و گێڕانەوەی ئەو کەسانەیە کە بەڵگە لەسەر زیندویی و ژیانی (خضر) دەهێننەوە، بۆچوونی ئەو کەسانە نییە کەدەڵێن مردووە.

(الحافظ إبن كثير) هەندێکی لەم حیکایەت و گێڕانەوانەی لە (تأريخ)ەکەیدا هێناوە، پاشان دەڵێت: زۆرینەی حیکایەتەکان (سند)ەکانیان (ضعيف) لاوازە، و کەمێکیشیان (صحيح) ڕاستن بەڵام (معصوم) نین، لە (صحابي) و کەسانی تریش، چونکە دەگونجێت هەڵەیان لێ ڕووبدات. خوا زاناترە.

(الآلوسي) دەڵێت: کە ئەوان مەبەستیانە و پابەندبن بەوەی کە (خضر) لە ژیاندا ماوە، ئەو حیکایەتانە دێنن کە دەما و دەم و گێڕانەوەن، پیاوێك هەواڵ دەدات کە (خضر)ی بینیوە...

زۆرینەی ئەو کەسانەی کەوای لێك دەدەنەوە بینیویانە بەو قسەیە لە خۆیان بایی دەبن کە دەڵێت من (خضر)م!! ئەوەیش زانراوە کە ناگونجێت باوەڕ بەو کەسانە بکرێت کەوا دەڵێن، بەبێ بەڵگە لەلایەن خواوە. دەبێت چۆن کەسی بینەر ئەوە بەڕاست بزانێت و بە درۆی نەخاتەوە؟![161]

* پێشەوا (إبن تيمه) دەڵێت: هەموو ئەوانەی کە لەم بوارەدا دەگێڕدرێنەوە، هەندێکیان درۆن، و هەندێکیشیان لەسەر گومانی کەسێك بنیات نراوە. بۆ نموونە: کەسێك پیاوێکی بینیوەو وا گومانی بردووە کە (خضر)ە وتویەتی: بەڕاستی ئەوە (خضر)ە! هەروەك (الرافضة) کەسێك دەبینن وا گومان دەبەن کە (الإمام المنتظر) بێت، یان بانگەشەی ئەوە دەکەن![162]

---

161 – روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني ٣٢١/١٥.

162 – مجموع فتاوى شيخ الأسلام إبن تيمة ١٠١/٢٧– ١٠٢.

## کۆتایی

بیستمان کە چی دەربارەی (خضر) وترا و دەربارەی ژیان ومردن و کۆبونەوەی لەگەڵ خەڵکیدا و بەیەك گەیشتنیان....هەروەها لێکۆڵینەوەکان و بەڵگەکان دەریان خست کە ڕاستییەکان لە چیدا دەردەکەوێت و زانایان بە بەڵگە و موناقەشەکانیان توانیان ڕەدی ئەو بۆچوون و ووتە هەڵانە بدەنەوە کە بە ناهەق لە مافی (خضر)دا ووتراون.

ئایا پاش ئەم هەموو لێکۆڵینەوەیە دەتوانین بگەینە ئەنجامی کۆتایی و دانی پێدا بنێین؟

کەواتە با بیرێك لەم دوو بۆچوونە بەرهەم هاتووە بکەینەوە:

١- ئەو کەسانەی کە دەڵێن مردووە بەڵگەیەکیان لانەبوو ڕاست بێت کە بیسەلمێنێت لە ژیاندا ماوە.

٢- هەروەها ئەو کەسانەی کە بۆچوونیان وایە زیندووە و لە ژیاندا ماوە، ووتیان: لەبەر ئەوەی دەقێك لەسەر مردنی یان لەسەر زیندویی نەهاتووە، ئایا چی قەدەغەی ئەوە دەکات کە زیندوو بێت؟

بە تایبەتی کە هەندێك لە زاناکان دەڵێن ماوە و زیندووە؟!

بێگومان قسە و گێڕانەوە و ئەفسانەی زۆر دەربارەی (خضر) ووتراوە وەك هەندێکیان باسکران، کە سەنەدەکانیان جیاواز بوون و بەڵگەکانیان ساغیان نەکردۆتەوە کە ڕاستە.

باسکردنی ژیانی (خضر) هەرچەندە هەندێکیان لە دەمی هاوەڵانەوە بووە، بەڵام ئەوەمان بە (سند)ی ڕاست بە دەست نەگەیشتووە کە بیسەلمێنێت یان ڕەتی بکاتەوە مردووە یان لە ژیاندا ماوە، هەرچی لەو بارەیەوە هاتبێت بە بەشێك لە ژیان و حاڵ و باسکردنی ئەو دانانرێت.

ڕەنگە بەهۆی ئەم چەند تێبینییەوە بتوانین هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگ و باسانەی (خضر) بزانین، کە لەسەر زمانی خەڵکی و لەناو عەوامەکاندا بڵاوە:

٣- یەکێك لەو هۆکارانەی کە ڕۆڵی گەورە و گرنگی بووە لە بڵاوکردنەوەی ناوەکەیدا بریتی بووە لە بوونی کۆمەڵێك (فەرمووده و هەواڵ) بۆ سەر لێ تێکدان و خراپ نیشاندانی ناو و باسی ئەو کەسایەتییە، وەك چەندین دانە لەو فەرمووده و هەواڵە (موضوع) و نادروستانە تێپەڕین و بیستمان...کە زانایانی ئەم ئوممەتە توانیان لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و ڕوونیان کردەوە.

٤- بەڕاستی زۆرێك لە چیرۆك و گێڕانەوەی ئیسرائیلی هاتوونەتە ناو کتێبەکانی مێژو و هەندێك لە کتێبەکانی تەفسیر و زۆریان لەسەر ووتراوە و ڕاستییەکانی تیا تێك دراوە، تا وای لێهاتووە کە ڕەواج بە هەواڵی وا دراوە کە هیچ بنەمایەکی لە دینەکەماندا نیە ئەم هەواڵانەیش بوونەتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ زۆرێك لە کتێبەکان بۆ (ترغیب) و (ترهیب) بەڵگەیشیان لەسەر ئەمە، ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (حدثوا عن بني إسرائيل ولا حرج) واتە: (ئێوە لە (بنی إسرائیل) هەواڵ بگێڕنەوە و باسی بکەن، گرفتێك نییە).

بەڕاستی زانایان کۆمەڵێك مەرجیان بۆ فەرموودە داناوە کە پێویستە ڕەچاو بکرێن.[١٦٣] بەڵام خەڵکی (عامة) گشتی کاتێك هەواڵ و کارێکیان لاخۆش بێت، بە ڕێگایەکی زانستی وەری ناگرن، بەڵکو بە پێی عاتیفە و هەوا و ئارەزووەکانیان وەری دەگرن، و کاتێك ئاوڕ دەدەنەوە بەلای نموونەی ئەم گێڕانەوانەدا بە لەزەت و خۆشییەوە وەری دەگرن و بە سەرسوڕمانەوە سەری

---

163 - سەیری (حكم رواية الإسرائيليات) لە کتێبی (الأسرائيليات و اثرها في كتب التفسير)ی (دکتور: رمزي نعناعة) بکە، لە لاپەڕە (٨٦)ەوە دەست پێدەکات.

بۆ دەلەقێنن، و بە شێوازێکی جوان لە یەکتری وەردەگرن و و لە دەور و بەری خۆیاندا بلاوی دەکەنەوە و دەیکەنە ووتەی ناو کۆڕ و مەجلیسەکانیان، ئیتر لەویٚ کارەکە تێکەڵ دەبێت و تێك دەچێت و بوارە زانستییەکەی لە دەست دەدات.

٥- ئەو کەسانەی کە چیرۆکەکان دەگێڕنەوە: بەڕاستی ئەوان شتێك دادەنێن کە (عامة) گشتی پێی ڕازی بێت، لە چیرۆك و حیکایەت و گێڕانەوە و ئەفسانە، خەیاڵ لە دەرون و ناخیاندا دەوروژێنێت و سۆز و عاتیفەیان دەجولێنێت هەر لەبەر ئەوەیە کە پیاوانی (حدیث) نەهی قوتابیان و براکانیان بکەن کە تێکەلاوی ئەو کۆڕ و مەجلیسانە بکەن، ....ڕەنگە ئەو گێڕەرەوانە، چیرۆك و حیکایەت دەربارەی خضر دروست بکەن و ڕێك بخەن تا شەوق و ڕەونەقی پیٚ بدەن بۆ خەڵکی گشتی...پاشان بۆیان بگێڕنەوە و ئەوانیش باوەڕیان پیٚ بکەن و بەڕاستی بزانن و لێی دڵنیا بن، بەڕاستی ئەمانە مەترسی گەورەیان لەسەر دین هەیە.[١٦٤]

خوێنەری بەڕێز...بوونی هۆکاری ئەم جیاوازیانەش گشتی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی (نص)دەقێکی یەکلاکەرەوە لە زیندویی (خضر) یان لە مردنیدا! ئەگەر (نص) دەقێك لەو بارەیەوە بهاتایە ئەوا کارەکە یەکلای دەبوویەوە و، موسڵمانان هەموو لێی سەلامەت و دڵنیا دەبوون، دەبینین ئەوە (عیسای کوڕی مریم) هەموو موسڵمانان باوەڕیان وایە کە هێشتا زیندووە، چونکە (نص)دەقێکی ڕاست و یەکلاکەرەوەی لەسەر هاتووە.

بەلام (خضر) هیچ دەربارەی نەهاتووە.

---

[164] بگەڕێرەوە بۆ (بحث لأسباب الوضع) لە کتێبی (أصول الحديث: علومُهُ و مصطلحه)ی (دکتور: محمد عجاج الخطيب) لە لاپەڕە ٤١٧ ەوە دەست پێدەکات.

ڕەنگە تۆ بپرسیت: بۆچی ئەم هەموو قسە و بۆچوونە لەسەر (خضر) بڵاو بێت و تایبەت بە كەسایەتی ئەو؟

وەڵام: چونكە یەكێك لەم دوو هۆكارە لەسەر بەردەوامی ژیانی باس كراوە.

– چونكە لە (عین الحیاة) سەرچاوەی ژیانی نۆشیوە!

–یان لەبەر ئەوەی كە باوكە ئادەم (علیه السلام)ی دفن كردووە.

بەڵام هەردوو هەواڵەكە بە بەڵگەی شەرعی یان عەقڵی ساغ نەبوونەتەوە وەك باسەكەی تێپەڕی!

گومانی زۆریش لەسەر ئەوەیە كە بڵاو بوونەوەی ئەم كارانە لە بوونی (إسرائیلیات)ەوەیە!

...(صوفي)یەكان باوەڕیان وایە كە تا ئێستایش ژیانی بەردەوامە، بەوەی كە لەگەڵ (ذوق) و حاڵی ئەواندا دەگونجێت... لەگەڵ ئەو حیكایەت و گێڕانەوانەی كە گوایە بەیەكگەیشتن هەبێت لە نێوانیاندا، حاڵی ئەوان بەو جۆرەیە لە كاری (تصوف)دا! گرنگ ئەوەیە كە پاش ئەم لێكۆڵینەوەیە ئەنجامی كۆتایی دەربخەین... كە ئەوەیش بەڕاستی شتێك نەهاتووە لەسەر بەردەوام زیندوویی ئەو یان بە خەڵك گەیشتبێت، بەڕاستی هیچ دەقێكی ڕاست یان هەواڵێك كە جێگەی دڵنیایی و متمانە بێت نییە. تەنها خوای گەورە زانا و شارەزایە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ (الفاطر:١١).

## سەرچاوەکان:

١- تيسير المنان في قصص القرآن: جمع وترتيب أحمد فريد.
٢- الخضر بين الواقع و التهويل: دراسة تحليلية مقارنة على ضوء القرآن والسنة والتأريخ: محمد خير رمضان يوسف.
٣- تفسير النابلسي: الدكتور محمد راتب النابلسي.
٤- المستفاد من قصص القرآن: تأليف: الدكتور عبدالكريم زيدان.
٥- مَعَ قصص السابقين في القرآن: الدكتور: صلاح عبدالفتاح الخالدي.
٦- قصص القرآن: حامد احمد الطاهر البسيوني.
٧- صفوة التفاسير: محمد علي الصابوني.
٨- قصص القرآن: جمع وترتيب: محمود المصري.
٩- قصص القرآن: عمرو خالد.
١٠- قصص الأنبياء و مَعَهُ سيرة الرسول (ﷺ): محمد متولي الشعراوي.
١١- قصص القرآن الكريم وسيرة سيد المرسلين: د.محمد مُنير الجنباز.
١٢- تفسير الشعراوي: محمد متولي الشعراوي.
١٣- تفسير الكبير: الفخر الرازي.
١٤- تەفسیری ئاسان: بورهان محمد أمين.
١٥- تەفسیری قورئانی پیرۆز: عثمان عبدالعزيز محمد.
١٦- تەفسیری: مامۆستا زمناکۆیی.
١٧- تەفسیری قورئانی پیرۆز: مامۆستا هەژار موکریانی.
١٨- الأمثل في تفسير كتاب اللهِ المنزل: العلامة: ناصر مكارم الشيرازي.
١٩- فەرهەنگی شیرین: فاضل نظام الدين.
٢٠- پوختەی صەحیحی موسلیم: لیژنەیەکی پسپۆر.

# ناوەڕۆك




خوێندنەوەیەك كراوە بۆ چیرۆكی خدری زیندە لەگەڵ موسا پێغەمبەردا (علیه السلام) كە دوو مەسئەلەی گرنگ یەكانگیری یەكتری دەبن، زانستی شەریعەت و زانستی حەقیقەت، خدری زیندە مەسئەلەی حەقیقەت بۆ موسا دەهێنێتەوە كە بەشەریعەت لێكنادرێتەوە و ناچێتە ژێر ڕاڤەوە، بەڵام موسا (علیه السلام) دەیەوێت بە شەریعەت ئاماژە و ڕاستكردنەوە بداتە خدر ، خدریش ڕوونكردنەوەی بابەتەكانی لە كۆتاییدا پێدەگەیەنێت.

موسا (علیه السلام) ویستی بگاتە ئەو دەریای حەقیقەتە، بەڵام پێی نەگەیشت لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەرێكی ڕاسپێردراو بوو.

هەردوو دەریای حەقیقەت و شەریعەتیش تەواوكاری یەكترن و دژیەك نین بەڵام شەپۆلەكانیان ناچوونیەكن.

عبدالجبار قەرەداغی

چاپخانەی سیما